بەختیاری

برایان ترەیسی

# بەڕێوەبردنی

# کات

وەرگێڕانی:
کەلسوم عومەر- مژدە محەمەد



Ktebi_PDF

238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsIbo_

Ktebi_PDF



براین ترەیسی

# بەڕێوەبردنی کات

وەرگێڕانی:
کەلسوم عومەر- مژدە محەمەد



# بەڕێوەبردنی

# کات

براین ترەیسی

وەرگێڕانی :
کەلسوم عومەر – مژدە محەمەد

ناسنامەی کتێب:

ناوی کتێب: بەڕێوەبردنی کات

نوسەر: براین ترەیسی

وەرگێڕ: کەلسوم عومەر - مژدە محەمەد

بابەت: گەشە پێدانی مرۆیی

چاپخانە: تاران

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: 2500 دینار

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٣١٦) ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە.

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی بەختیاری

سلێمانی - شەقامی مەولەوی

٠٧٧٠١٤٩٥٢٧٠

# پێڕست

# بەشی یەکەم
## سایکۆلۆژیای بەڕێوەبردنی کات

چۆنێتی بیرکردنەوەو هەستکردنن سەبارەت بە ژیان بە شێوەیەکی بەرچاو چۆنێتی ژیانت دیاری دەکات، وە کرۆکی هەستەکانت بۆ کەسایەتیت، ڕێزی خودییت، دەریدەخات کە چەندە خۆتت خۆشدەوێت.

ڕێزی خودییت بەو ڕێگا و شێوازانە دیاری دەکرێت کە بەکاریدەهێنین لە پەرەدان بە توانا شاراوەکانت، کاتێك بە کارامەیی کاردەکەیت، ڕێزی خودییت زیا دەکات، وە بە پێچەوانەشەوە بەرەو کەمی دەچێت کاتێك بە کارامەیی کار نەکەیت.

وێنەدانەوەی ڕێزی خودیی کە پێی دەوترێت "خودکارایی" پێناسە دەکرێت بە پلەی هەستکردنت بە خۆت کە چەندە کەسێکی شایستە، بەتوانا، داهێنەریت، وە توانای چارەسەری کێشەکانی خۆت هەیەو دەتوانیت کارەکانت ئەنجام بدەیت و ئامانجەکانت بەدەست بهێنیت.

هەتاوەکو زیاتر هەست بە شایستەیی و بەتوانایی و داهێنەریی خۆت بکەیت، ڕێزی خودیی و داهێنەری و

بـەتوانایيت زيـاتر دەكـات. هــەر بەشــێك تەواوكــەر و پشتگیریکەری بەشەکەی دیکەیە.

ئەو كەسانەی كە بە باشی كاتەكانیان بەڕێوە دەبەن هەمیشە هەستێكی ئەرێنییان هەیە و باوەڕیان بە خۆیان هەیە لە ژیانیاندا.

### یاسای دەست بەسەرداگرتن

سـایكۆلۆژیای كـات بـەڕێوەبردن لەسـەر بنەمایـەكی سـادە دامــەزراوە، پێــی دەوترێــت یاســای دەســت بەسەرداگرتن، ئەم یاسایە دەڵێت چەندە هەست بكەیت كە ژیانی خۆت جڵەوگیر كردووە ئەوا ئەوەندە هەست بە باشی دەكـەیت سـەبارەت بـە خـۆت. هـەروەها یاسـاكە دەڵێـت كـە چەند هەست بكەیت جڵەوگیری ژیانی خۆت لەدەست داوە ئـەوا ئەوەنـدە هەسـت بـە نـەرێنی دەكـەیت سـەبارەت بـە خودیی خۆت.

دەروونناســان ئامــاژە دەكــەن بــە جیــاوازی نێــوان جڵەوگیری ناوەكی، كاتێك وا هەست دەكەیت كە گەورەو مامۆستای چارەنووسی خۆتیت، وە جڵەوگیری دەرەكی، كاتێــك وا هەســـتدەكەیت كـــە لەلایـــەن بـــارودۆخ و چواردەورتەوە جڵەوگیر كراویت.

كاتێك جڵەوگیری دەرەكیت هەیە، وا هەست دەكەیت كـــە لەلایـــەن ســـەرۆك وە یـــاخود لەلایـــەن كـــارو بەرپرســـیارێتییەكانتەوە جڵـــەوگیر كراویـــت، وا هەســـت

دەکەیت کە دەبێت کارێکی زۆر ئەنجام بدەیت وە کاتێکی کەمیشت هەیە، وە هەروەها وا هەست دەکەیت کە بەڕاستی لە ئاستی بەرپرسیارێتی کات و ژیانتدا نیت. هەموو ئەو شتانەی کە کاتژمێر بە کاتژمێر ئەنجامیان دەدەیت تەنها وەڵامدانەوەو کاردانەوەیە بۆ ڕووداوە دەرەکییەکان.

جیاوازییەکی یەکجار زۆر هەیە لەنێوان ئەو کردارانەی کە دیاریکردنی خودی و ئامانج ئاڕاستەکەرن، لەگەڵ کاردانەوەکان کە وەڵامێکی دەستبەجێن بۆ فشارە دەرەکییەکان.

جیاوازییەکە لەنێوان هەستکردنی ئەرێنی و جڵەوگیری ژیانت وە هەستکردن بە نەرێنی، فشارو پەستانە دەرەکییەکاندایە.

بۆ ئەوەی باشترینەکان ئەنجام بدەیت، دەبێت هەستێکی بەهێزی جڵەوگیریت هەبێت لە بوارە گرنگەکانی ژیانی کەسی و کارەکەتدا.

## بیرکردنەوە و هەستەکانت

لە زاراوەکانی دەروونناسیدا هاتووە کە هەرکەسێك "تێگەیشتنێکی خودیی" هەیە، بەرنامە ناوەکییەکان کە دەست دەگرێت بەسەر ڕەفتارەکانیدا لە هەموو بوارە گرنگەکانی ژیاندا. ئەو کەسانەی کە ئاستی "تێگەیشتنی خودی" بەرزیان هەیە بە لەبەرچاوگرتنی بەڕێوەبردنی

کاتەکانیان، وەك کەسێکی باش ڕێکخراو و داهێنەر بیر لە خۆیـــان دەکەنـــەوە ، وە هەمیشـــە خۆیـــان لـــە ئاســـت بەرپرسیارێتی ژیان و کارەکانیاندا دەبینن.

تێگەیشـــتنی خودییـــت، پێکهـــاتووە لـــە هـــەموو بیرۆکەکانت، وێنەو خەیاڵەکانت وە باوەڕەکانت سەبارەت بە خۆت، بە تایبەتیش بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕێگایەی کە کاتەکەتی پێ بەڕێوەدەبەیت.

هەندێك خەڵك باوەڕیان بە خۆیان هەیە کە لە ئەوپەڕی باش ڕێکخستن و کارامەییدان. ئەوانی دیکە بەردەوام وا هەست دەکەن کە بەزێندراون بە داخوازییەکانی کەسانی دیکەو بارودۆخەکان.

## باوەڕەکان دەبنە ڕاستی

باوەڕەکانـــت ســـەبارەت بـــە خـــۆت و تواناکـــەت بـــۆ بەڕێوەبردنی کاتی خۆت چین؟ ئایا خۆت وەك کەسێکی کارامە دەبینیت و وا هەست دەکەیت کە کەسێکی کاریگەر و کارامەیت لە بەڕێوەبردنی کاتدا؟ ئایا باوەڕت وایە کە کەسێکی داهێنەریت و لە جڵەوگیرییەکی تەواوی ژیان و کارەکەتدایت؟ باوەڕەکانت هەرچییەك بن، ئەگەر وەك کات بەڕێوەبـــەرێکی نایـــاب بـــیر لـــە خـــۆت بکەیتـــەوە، ئـــەوا بەشێوەیەکی سروشتی ئەو شتانە ئەنجام دەدەیت کە چوونیەکن لەگەڵ ئەو باوەڕەتدا.

تێگەیشتنی خودیت واتلێدەکات کە بە بەردەوامی هەوڵی سازدان بدەیت لەنێوان ئەو کەسەی کە خۆت دەبینیت، لە ناوەوەت، وە ئەو شێوازەی کە کاری پێدەکەیت لە دەرەوە ئەگەر باوەڕت وابێت کە کاتەکەت بە باشی بەڕێوەدەبەیت ئەوا دەبیتە کات بەڕێوەبەرێکی باش.

دەتوانیت بەشداری هەموو خولەکان بکەیت لەسەر بەڕێوەبردنی کات، هەموو پەرتوکەکان بخوێنیتەوە، وە مەشقی چەندان شێواز بکەیت، بەڵام ئەگەر وا هەست بکەیت کە کات بەڕێوەبەرێکی لاوازیت، ئەوا هیچ شتێك ناتوانێت یارمەتیت بدات. ئەگەر پەرە بدەیت بەو خووەت کە درەنگ بکەویت لە چاوپێکەوتن و کۆبوونەوەکانت، یاخود بڕوات وابێت کە کەسێکی ناڕێك و ئاژاوەچیت، ئەوا ئەم خووانەت بە شێوەیەکی خودکارانە دەبنە ڕەفتار و ڕەوشتەکانت.

وە ئەگەر بیروڕاکانت سەبارەت بە ئاستی کارامەیی و کاریگەری کەسیت نەگۆڕیت، ئەوا تواناکەت بۆ بەڕێوەبردنی کات هەرگیز ناگۆڕێت.

### بڕیارێك بدە

چۆن پەرە بە بیروباوەڕە تازەو ئەرێنییەکان سەبارەت بە خۆت و ئاستی داهێنەری کەسیت دەدەیت؟ خۆشبەختانە، کارێکی گران نییە. بە شێوەیەکی سادە

پێویستی بە ویست، یەکلایی کردنەوە، نەخشەدانان و (مەشقکردن) هەیە. گرنگترینیان: بڕیاردانە بۆ برەودان بە خووە تایبەتەکانی کات بەڕێوەبردن، وەك ئامادەبوونی پێشوەختە لە هەموو کۆبوونەوەکاندا بۆ پێشبینی کردنی داهاتووت.

هەموو گۆڕانێك لە ژیانتدا کاتێك دەبێت کە بڕیارێکی ڕاست و دروست دەدەیت بۆ ئەنجامدانی کارێك بە شێوەیەکی جیاواز. بڕیاردان بۆ ئەوەی ببیتە کات ڕێکخەرێکی نایاب یەکەم هەنگاوی سەرەکییە.

## بەرنامەداڕێژی هزرت بکە

هەر کە بڕیارت دا ببیتە کەسێکی داهێنەری مەزن، ئەوا زنجیرەیەك لە شێوازی بەرنامەیی کەسیی هەن کە دەتوانیت مەشقیان بکەیت.

یەکەمیان: ئەوەیە کە گفتوگۆی ناوەکیت بگۆڕیت، لە سەدا نەوەدو پێنجی هەست و کردارەکانت دیاریکراون بەو ڕێگایەی کە تۆ قسەی پێدەکەیت لەگەڵ خۆتدا لە زۆربەی کاتەکاندا. هەمیشە ئەم وتەیە بۆ خۆت دووبارە بکەرەوە "من کەسێکی ڕێکخەرو داهێنەرم" کاتێك بەهۆی کارو چالاکییەکانتەوە تەواو ماندوو دەبیت ئەوا کاتێك وەربگرە و بڕۆرە دەرەوە بە خۆت بڵێ.. "من کەسێکی ڕێکخەر و داهێنەرم".

هەمیشە ئەم وتەیە دووبارە بکەرەوە و بە خۆت بڵێ:
"من کات بەڕێوەبەرێکی نایابم".

هەر کاتێک ئەم وتانە بە خۆت دەڵێیت ئەوا مێزی بەناگایت ئەم وتانە وەک فرمانێک وەردەگرێت و دەست دەکات بە هاندان و ڕێنوێنی کردنت تاوەکو بەڕاستی لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانتدا ببیتە کەسێکی ڕێکخراو.

## بەو شێوەی دەتەوێت، وێنای خۆت بکە

دووەم ڕێگا بۆ گۆڕینی ڕەفتار و کردەوەکانت: ئەوەیە کە وێنای خۆت بکەیت وەک کات ڕێکخەرێکی نایاب و سەرکەوتوو. خۆت وەک کەسێکی ڕێکوپێک و کارامە ببینە کە جڵەوگیری ژیانی خۆت کردبێت.

لەبیرت بێت ئەو کەسەی کە لە ناوەوە دەیبینیت، دەبێتە هەمان ئەو کەسەی کە لە دەرەوەتە.

ئەگەر بوویتە کەسێکی ڕێکخراو و داهێنەر، ئەوا چۆن بە شێوەیەکی جیاواز ڕەفتار دەکەیت؟ چی جیاوازییەکی دەبێت لەگەڵ ئەو شێوازەی ئەمڕۆ ڕەفتاری پێدەکەیت؟

وێنەی کەسێکی هێمن، باوەڕبەخۆ بوو، کارامە، بۆ خۆت دروست بکە، کەسێک کە بتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا چەندین کار بەئەنجام بگەیەنێت.

وێنای ئەوە بکە کە کەسی داهێنەر دەبێت چۆن بێت. ئایا مێزی کارەکەی ڕێکخراو و پاک و خاوێنە؟ ئایا کەسەکە

وا دەردەکەوێت کە پەلەی نەبێت و فشاری لەسەر نییە؟ وێنەیەکی ڕوونی خۆت لە مێشکتدا دروست بکە، وەك کەسێك کە جڵەوگیری تەواوی ژیان و کاتەکانی کردبێت.

## وایدابنێ "ئەگەر"

سێهەم ڕێگا بۆ بەرنامەڕێژیکردنی خۆت: ئەوەیە کە وایدابنێیت بەڕێوەبەرێکی باشی کاتیت. بیر لە خۆت بکەرەوە کە ڕێکخەرێکی باشیت لە هەموو ئەو شتانەی ئەنجامی دەدەیت. ئەگەر بەڕێوەبەرێکی باشی کات بیت، ئەوا چۆن ڕەفتار و هەڵسوکەوت دەکەیت؟ چ شتێك ئەنجام دەدەیت بە جیاوازی؟ بە لەبەرچاوگرتنی کات و داهێنانە کەسییەکانت، چ شتێك جیاواز دەبێت لەو ڕێگایەی کە ئێستا شتەکانی پێئەنجام دەدەیت؟

ئەوەی جێگای دڵخۆشییە، تەنانەت ئەگەر بیر لەوەش نەکەیتەوە کە بەڕێوەبەرێکی باشی کاتیت ئەمڕۆ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وایدادەنێیت کە کەسێکی ئاوهابیت، ئەوا ئەم کردارانەت هەستی کارامەیی کەسیت لا دروست دەکەن. لە ڕاستیدا دەتوانیت کردارەکانت، خووەکانت وە هەڵسوکەوتەکانت بگۆڕیت، کاتێك وایدادەنێیت هەتاوەکو دەیکەیت بە ڕاستی.

## بەشی دووەم
## نرخ و بەهاکانت دیاری بکە

لە کاتێکدا بەڕێوەبردنی کاتەکەت بەڕێوەبردنی ژیانتە، ئەوا برەودان بە داهێنانە کەسییەکانت بە تاقیکردنەوەی بەهاکانت دەست پێدەکات. یەکێك لە یاساکانی (مۆرفی) دەڵێت کە بەر لەوەی هەر کارێك ئەنجام بدەیت، پێویستە سەرەتا شتێکی دیکە بکەیت. مەحاڵە بتوانیت کاتەکانت بە باشی بەڕێوەببەیت هەتاوەکو نەزانیت بە تەواوی نرخ و بەهاکانت چین.

کات بەڕێوەبردنێکی باش پێویستی بەوەیە کە جڵەوگیری زنجیرە ڕووداوێك بکەیت و بیانگونجێنیت لەگەڵ ئەو شتانەی کە بۆت گرنگن. ئەگەر ئەمە بۆت گرنگ نییە، کەواتە هەرگیز هەست بە هاندان ناکەیت و ناتوانیت جڵەوگیری کاتەکەت بکەیت.

ئەمە لە خۆت بپرسە: "بۆچی ئەمە دەکەم؟" بۆچی بەیانیان لە خەو هەڵدەستیت؟ بۆچی ئەو کارە دەکەیت کە دەیکەیت؟ هۆکار چییە لەو شوێنە کار دەکەیت کە لێیتی؟

### واتا و مەبەستەکان

هەموو کەسێك مەبەست و ئامانجێکی زۆری هەیە لە ژیاندا، یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی فشاری کەسی و

بێتاقەتییەکان ئەو هەستەیە کە ئەوەی ئەنجامی دەدەیت هیچ واتاو مەبەستێکی نییە، دەبێت هەمیشە بپرسیت: "بۆچی؟"

دەتوانیت ببیتە کەسێکی کارامەتر بە تەکنیك و شێوازەکانی کات بەڕێوەبردن، بەڵام ئەمە هیچ باشییەکی بۆت نابێت ئەگەر تەنها کارامە بیت لە ئەنجامدانی شتێك کە هیچ واتا و گرنگییەکی بۆت نییە. لەم کاتەدا کارامەیی زیاتر هەستەکانی نامۆبوون، نائومێدی و دڵەڕاوکێت زیاتر دەکەن.

**بەنرخترین شت بۆ تۆ چییە؟ (بە بەهاترین شتی ژیانت چی یە؟)**

پرسیارێکی دیکە کە پێویستە لە خۆتی بپرسیت ئەوەیە، "بەبەهاترین شت لە ژیانت چییە؟" بەڕاستی گرنگی بە چ شتێك دەدەیت؟ گرنگی بە چی نادەیت؟ تەنها کاتێك هەست بە دڵخۆشی، بەنرخی و سودمەندی دەکەیت کە چالاکییەکانی ڕۆژانەت گونجاو بن لەگەڵ بەهاکانت. زۆرینەی هەرە زۆری بێتاقەتی و نائومێدی و پەستەکانی هەردووك ژیان و کارەکەشت بەهۆی ئەوەیە کە کارێك ئەنجام دەدەیت بەڵام بەهاو نرخت بۆ شتێك داناوە کە بە تەواوی جیاوازە لەو کارەت.

چەندین ڕاپۆرت و پەڕاو هەن سەبارەت بە ئەزموونەکانی کارمەندەکان کە سوتێنراون بەهۆی ئەو

زەبــرو پەســتانی کارانــەی بەســەریانەوەیە، بــەڵام ئــەو کەسـانەی کـە کارەکـەی خۆیـان خۆشـدەوێت، بـە تـەواوی دڵیــان دەدەن بــە کارەکــەیان لەبەرئــەوەی کارەکــەیان وێنەدانـەوەی بەهاکانیانـە، بـە دەگمـەن تووشـی فشـاری دەروونی و جۆرەکانی دەبنەوە. کاتێك بە هاوسەنگی لەگەڵ بەهاکانتدا دەژیت، هەمیشەو بەردەوام هەست بە هەڵقوڵانی وزە و توانا، پەرۆشی و داهێنانی زیاتر دەکەیت. فشارەکان بـەهۆی ئـەوەوە دروسـت دەبـن کـە ئـەو کارانـەی ئـەنجامی دەدەیت هاوسەنگ نین لەگەڵ بەرزترین نرخ و بەهاکانتدا.

## تۆ نائاساییت

ئـەوە بزانـەو پەسـەندی بکـە کـە تـۆ کەسـێکی یـەکتاو بێوێنەیت. نرخ و بـەهاکانت بـەردەوام و بـە درێـژایی مـاوەی ژیانـت لـە گەشـەکردن و پەرەسـەندندا دەبـن. لـە ئـەنجامی ئــەزموون و کاریگەرییــە بێشــومارەکانەوە دەردەکــەون. بەشێکن لە کەسایەتی و تایبەتمەندیت. زۆر بە دەگمەن و بە تێپەڕبوونی کات دەگۆڕێن. ئەرکی تۆ ئەوەیە کە بزانیت نــرخ و بــەها ڕاســتەقینەکانت کامانــەن وە پاشــان ژیانــت ڕێکبخـەیت هـەر بـەم هۆیـەوە بتوانیـت ژیـان و کارکردنـت هاوسەنگ بکەیت لەگەڵ ئەم بەهایانەدا.

## لێکۆڵینەوە لە خۆت بکە

لێرەدا ڕامێنانی تەواوکردنی چوار ڕستەمان هەیە کە دەتوانیت بەکاریبهێنیت بۆ ئەوەی بەرچاو ڕوونییەکی باشترت هەبێت بۆ ئەو کەسەی کە هەیت لە ناخەوە. هەر ڕستەیەك تەواو بکە:

١) "من..." ئەگەر کەسێکی نەناسراو لێت بپرسێت "بەڕاستی تۆ کێیت؟" ئەوا وەڵامی تۆ چی دەبێت؟ ئەو یەکەم وشانە چین کە بۆ پێناسەکردنی خۆت بەکاریان دەهێنیت؟ ئایا لە لایەنی کارەکەتەوە، یاخود خاسیەتەکانت وەك کەسێك، هیواکانت، خەونەکانت و خولیاکانت پێناسەی خۆت دەکەیت؟ سێ بۆ پێنج وشە هەڵبژێرە بۆ تەواوکردنی ئەم ڕستەیە "من...".

ئەگەر چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسانی دەوروبەرت بکەیت، یاخود ئەو کەسانەی کە لەگەڵت دەژین و کارت لەگەڵ دەکەن، وە هەمان پرسیاریان لێبکە سەبارەت بە خۆت، ئایا چی دەڵێن؟ کەسانی دیکە چۆن پێناسەت دەکەن لە ڕووی بەهاکان و ئەو کەسەی کە هەیت؟ لەسەر بنچینەی ئەو شێوازەی کە هەڵسوکەوت و مامەڵە لەگەڵ کەسانی دیکە دەکەیت، ئەو دەرەنجامە چییە کە دەستیان دەکەوێت سەبارەت بەوەی کە تۆ چ جۆرە کەسێکیت لە ناوەوە؟

٢) "خەڵکی..." بیر لە خەڵکی بکەرەوە، ئەوانە کە لە جیهانی دەوروبەرتن. چۆن پێناسەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەکەیت؟ ئایا خەڵکی باش، گونجاو و خۆشویستراون؟ ئایا خەڵکی تەمەڵ، تەڵەکەباز و پشت پێنەبەستراون؟

وەڵامەکەت کاریگەرییەکی زۆری دەبێت لەسەر ئەوەی چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دیکە دەکەیت لە هەموو بەشەکانی ژیانتدا. ئەمە هەموو شتێك دیاری دەکات کە بەدەستی دەهێنیت وەك جێبەجێ کارێك و وەك کەسێك لەگەڵ خێزان و هاوڕێکانیدا.

٣) "ژیان بریتییە....." لێرەدا وەڵامەکەت ڕەنگە ئاسان و سادە بێت، بەڵام ئەمە قسە لەسەر تەواوی فەلسەفەی ژیانت دەکات.

کەسانی دڵخۆش و تەندروست و ئەرێنی ژیان وەك ئەزمونێکی بێهاوتا دەبینن کە پڕە لە بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەکان (خۆشی و ناخۆشییەکان) بەڵام بە دڵنیاییەوە سەرتاپای سەرکێشییە.

یەکێك لە چیرۆکە دڵخوازەکان لەلام چیرۆکی ئەو کوڕە گەنجەیە کە دەچێتە لای فەیلەسوفێکی پیرو پێی دەڵێت "ژیان زۆر ئەستەمە". فەیلەسوفەکە وەڵام دەداتەوە دەڵێت "بە بەراورد لەگەڵ چی؟"

وەك (هـــێلین کێلـــەر) دەڵێـــت "ژیـــان یـــاخود سەرکێشییەکی چاونەترسانەیە، یاخود هیچ نییە". ژیان چییە بۆ تۆ؟

٤) "گەورەترین ئامانج لە ژیان بریتییە لە ..." ئەگەر بتوانیت دارەجادوویەکەت با بدەیت و بە تەنها یەك ئاواتی مەزن بەدەست بهێنیت ئەوا ئەو ئامانجە کامە دەبێت کە گەورەترین کاریگەری ئەرێنی دەبێت لە ژیانتدا؟ ئێستا ئەم ڕستانە تەواو بکە:

"گەورەترین ئامانجم لە کارەکانمدا بریتییە لە...."

"گەورەترین ئامانجم بۆ خێزانەکەم بریتییە لە ..."

ئەمانە گرنگترین و کاریگەرترین پرسیارن کە هەمیشە بتوانیت لە خۆتی بپرسیت و وەڵامی بدەیتەوە بۆ خۆت. کاتێك ڕوون و ئاشکرا دەبیت سەبارەت بە وەڵامەکانت -کە ڕەنگە ئاسان نەبن- لە پاشان دەتوانیت لە خۆت بپرسیت کە پێویستە چ گۆڕانکارییەك بکەیت تاوەکو بەکارهێنانی کاتەکەت و لە پێشبینییەکانی ژیانت زیاتر لەگەڵ یەکتر گونجاو بن.

(ئاپلیۆن هێل) تێبینی ئەوەی کردووە کە ژیان تەنها بۆ ئەوە دەستی پێکردووە تاوەکو گەورەبێت کاتێك بڕیارێکی ڕوون و ئاشکرا دەدەیت لەسەر گەورەترین و گرنگترین ئامانجت لە ژیاندا؟

گرنگترین ئامانجەکانت چین؟

## بەشی سێهەم
## بیر لە دید و ئەرکە سەرەکییەکانت بکەرەوە

یەکێك لە باشترین و کاریگەرترین پەرتووکەکان کە لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا نوسراون، پەرتوکی "بیرکردنەوەی هێواش و خێرای" دانیاڵ کاهینمانە. ڕوانگەکەی ئەوەیە کە ئێمە پێویستە دوو جۆری جیاواز لە بیرکردنەوە بەکاربهێنین تاوەکو مامەڵە لەگەڵ ئەو بارودۆخە جیاوازانەدا بکەین کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا تووشی دەبین.

بیرکردنەوەی خێرا، ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە کە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بەرپرسیارێتی و چالاکی و کێشەو بارودۆخ و ئەرکە کورت خایەنەکاندا بەکاری دەهێنین. بە خێرایی و نەژادیانە کردار دەکەین. لە زۆربەی کاتەکاندا، بیرکردنەوەی خێرا بە تەواوی گونجاوە بۆ چالاکییەکانی ڕۆژانەمان.

دووەم جۆری بیرکردنەوە کە (کاهینمان) بۆمان باسدەکات، بیرکردنەوەی هێواشە. ئەمە کاتێکە کە دەگەڕێیتەوە دواوەو کاتی زیاتر تەرخان دەکەیت بۆ ئەوەی بە تەواوی و وردی بیر لەوە بکەیتەوە کە دەتەوێت ئەنجامی بدەیت بەرلەوەی بڕیاری لەسەر بدەیت. بەرچاوڕوونییەکەی (کاهینمان) ئەوەبوو کە شکستهێنان لە بیرکردنەوەی

هێـواش لـە کاتێکـدا کـە پێویسـتە هۆکـاری زۆرینـەی هەڵەکانمانە کە لە ژیانماندا ئەنجامی دەدەین.

تاوەکو ببیتە کەسێکی کارامە لە بەڕێوەبردنی کاتدا و جڵـەوگیری تـەواوی ژیانـت بکـەیت، ئـەوا پێویسـتە بـە شـێوەیەکی ڕێکوپێـک بیرکردنـەوەی هێـواش لـە کـات و شوێنی پێویستی خۆیدا بەکاربهێنیت. بەم پرسیارە دەست پێبکە "هەوڵدەدەم چی ئەنجام بدەم؟"

**بەرلەوەی دەست بەکاربیت، بیر بکەرەوە**

زۆرجار ئەوپەڕی کاری گران دەکەیت و خۆت ماندوو دەکـەیت لـە کارەکەتـدا، بـەڵام کاتـت تـەرخان نـەکردووە بـۆ ئـەوەی بـیر لـەوە بکەیتـەوە کـە بەڕاسـتی دەتـەوێت چـی بەدەست بهێنیت.

چیرۆکی ژن و مێردێـك هەیـە کـە بـە ئوتومبێـل گەشـت دەکـەن لـە سـانتیاگۆوە بـەرەو لـۆس ئـەنجلۆس. پیاوەکـە شارەزای ڕێگاکە نـەبوو بەڵام بـەردەوام بەوپـەڕی خێراییـەوە ئۆتۆمبیلەکـەی لێـدەخوڕی. لـە خاڵێکـدا، ژنەکـەی لێـی پرسـی: "ئازیزەکـەم، سـیمرخ لەسـەر ڕێگـای لـۆس ئەنجلۆسە؟"

پیاوەکە وتـی: "بۆچی ئـەم پرسیارە دەکـەیت؟" ژنەکە وەڵامـی دایـەوە، "ئـاخر، ئێسـتا بـەلای نوسـراوێکدا ڕۆشتین

کە دەڵێت ئێمە لەسەر ڕێگەی سیمرخین." پیاوەکە وتی: "کێشە نییە، ئێمە کاتێکی خۆش بەسەر دەبەین!".

بەرلەوەی پێ لەسەر تاوەری ژیانی خۆت دابنێی، دەبێت تەواو دڵنیابیت سەبارەت بەو شتەی کە بەڕاستی هەوڵدەدەیت بەدەستی بهێنیت.

(ئەمبرۆس بایرس) لە (قاموسی ئەهریمەندا) نووسیویەتی کە "پێناسەی دەمارگیری بریتییە لە چەندجارە کردنی هەوڵەکانت لە پاش ئەوەی ئامانجەکەت لەبیرکردووە".

ئایا ئامانجت بۆ دروستکردنی ژیانێکی مەزنە؟ ئایا هەوڵدەدەیت بۆ بونیادنانی کارێکی مەزن؟ یاخود بەدەستهێنانی بەشێکی کاری مەزن؟ تواناکەت بۆ گەڕانەوەت بۆ دواوەو ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی خودیی و دەورن پشکنین -بیرکردنەوەی هێواش- زۆر پێویستن بۆ تۆ تاوەکو کاتەکانت ڕێکبخەیت بە شێوەیەك کە داهێنەرترین کەس بیت وە ئەوەی کە زۆرترین ڕێژەی خۆشی و دڵخۆشی و قایل بوون بەدەست بهێنیت لەوەی کە ئەنجامی دەدەیت.

### لە مێشکتدا کۆتاییەك بۆ کارەکەت دابنێ

تەواو ڕوون و ئاشکرابە سەبارەت بەو دەرەنجامانەی کە ئارەزووی دەکەیت، وەك (ستیڤن کۆڤی) دەڵێت: "بە

لەبەرچاوگرتنی کۆتایی کارەکەت لە مێشکتدا دەستبەکار بە".

ئەو دەرەنجامە کۆتاییانە کامانەن کە دەتەوێت بەدەستی بهێنیت؟ دەتەوێت لە کوێ بە کۆتا بگەیت لە کۆتایی ڕۆژەکەتدا؟ کاتێك بەسەر پلیکانەی سەرکەوتندا سەردەکەویت، دڵنیابەرەوە لەوەی بەرەو شوێنی ڕاست و دروستت دەبات.

ئایا کاردەکەیت لەبەرئەوەی پارەی پێویست بەدەست بهێنیت تاوەکو دڵنیایی و دڵخۆشیت بەدەست بهێنیت؟ ئایا کاردەکەیت لەبەرئەوەی کارەکەتت خۆشدەوێت، یاخود لەبەرئەوەی وا هەست دەکەیت ئەمە ئەرکێکە بۆ بەدەستهێنانی شتێکی گرنگ؟ ئاخۆ جیهانت چۆن دەبێت ئەگەر گەورەترین ئامانجت بەدەست بهێنیت؟ بە درێژایی کاتەکەت تێڕوانینت بۆ خۆت و کارەکەت چۆن دەبێت؟ ئەرکی سەرەکیت چییە؟ دەتەوێت چ جیاوازییەك لە ژیانی کەسانی دیکەدا دروست بکەیت؟

ئەگەر هەموو ئەوەی کاری بۆ دەکەیت بۆ بەدەستهێنانی پارە بێت تاوەکو کرێی پسوڵەکانتی پێبدەیت، ئەوا زۆر ئەستەم دەبێت بۆت کە پارێزگاری لە ئاستی بەرزی پەرۆشی و پابەندبوونت بە کارەکەت بکەیت. بۆ ئەوەی هەست بە دڵخۆشی و قایلبوونی ڕاستەقینەی بکەیت، دەبێت بە جۆرێك کار بکەیت بۆ بەدەستهێنانی

شتێک کە گەورەترە لە خۆت و جیاوازی لە ژیان و کاری ئەوانی دیکەشدا دروست دەکات.

## لێکۆڵینەوە لە شێوازەکانی بە ئەنجام گەیاندنی کارەکانت بکە

کاتێک تەواو ڕوون و ئاشکرا دەبێت سەبارەت بەوەی هەوڵ دەدەیت چی ئەنجام بدەیت، لە پاشان پێویستە لەسەرت کە بپرسیت "دەبێت چۆن هەوڵی ئەنجامدانی بدەم؟" هەرکاتێک ئەم دوو پرسیارەت کردووە وەڵامت دانەوە، ئەوا بەرچاو ڕوونی بە نرخت دەبێت کە یارمەتیت دەدات سەیری بارودۆخی خۆت بکەیت و بزانیت کە ئایا لەسەر هێڵگە ڕاستەکەیت یاخود نا.

هەر کە تەواو دڵنیابوویت سەبارەت بەوەی هەوڵی چی دەدەیت و چۆن هەوڵدەدەیت بە ئەنجامی بگەیەنیت، ئەوا لە پاشاندا پێویستە لەسەرت کە ئەم پرسیارە لە خۆت بکەیت: "کارەکەت چۆن دەڕوات؟".

ئایا ئەوەی ئەنجامی دەدەیت بە شێوەیەکی کاریگەرو خێرا بەرەو ئەو ئامانجەت دەبات کە دەتەوێت؟ ئایا ڕازی و دڵخۆشیت بە تێکڕای بەرەو پێشچوونەکەت؟ ئایا شتەکان بەباشی بەڕێوەدەچن؟ وە یاخود لەسەر ڕێگاکەت تووشی چەندین ئاستەنگ و بەربەست بوویت؟

بەزۆری پرسیار لە ئەگەرەکانت بکە، وەك پیتەر درەککەر دەڵێت: "ئەگەرە هەڵەبارەکان ڕاکشاون بەسەر ڕەگی هەموو شکستێکەوە".

ئەگەرو گومانەکانت چین سەبارەت بە ژیان و کارەکەت؟ ئەگەرە بە ئاگاو ئەگەرە بێ ئاگا و نەپرسراوەکان چین؟ شتێکی سەرسوڕهێنەرە کە چەندان کەسی ئیشکەر لەسەر بنچینەی چەند ئەگەرێکی هەڵە کاردەکەن کە هەرگیز نەیانپرسیوە.

**بەدوای ڕێگە شێوازێکی باشتردا بگەڕێ:**

لە کاتێکدا کە بیر لە پرسیاری "کارەکە چۆن دەڕوات"؟ دەکەیتەوە ئەوا باشترەکە پرسیارێکی دیکەی گرنگیش لەیاد نەکەیت ئەویش ئەوەیە کە بپرسیت: "ئایا دەبێت ڕێگایەکی باشتر هەبێت؟"

ڕاستییەکە ئەوەیە کە لانی کەم هەمیشە ڕێگای جیاوازو باشتر هەیە لە بەدەستهێنانی ئامانجە بازرگانیەکانتدا، ئەم ڕێگایانەی دیکە ڕەنگە خێراتر، ئاسانتر، هەرزانتر و کاریگەرتر بن.

وتەیەکی جوان هەیە کە دەڵێت: "شتی باشتر هەن بۆ ژیانوەك لەوەی تەنها خێراییەکەی زیاد بکات".

زۆرێك لە خەڵکی کاری گران و جدی دەکەن، بەڵام بە ئاڕاستەیەکی هەڵەدا دەڕۆن لەسەر ڕێگایەکی هەڵە، هیچ

ڕوون و ئاشکرا نین سەبارەت بەو شتانەی کە دەیانەوێت ئەنجامی بدەن و کەی و لە کوێدا کۆتایی پێبهێنن، بەلام نایانەوێت ڕووبەڕووی ئەو ئەگەرانە ببنەوە کە ڕەنگە بیسەلمێنیت هەڵەن.

قۆناغەکانی پرسینی ئەم پرسیارە دژوارانە پێویستی بە بیرکردنەوەی هێواش هەیە، بەلام بە شێوەیەکی کاریگەر دەکرێت خێرایی بەدەستهێنانی ئامانجەکانت لە کارو پیشەو ئەرکەکانت دا زیاد بکات.

## بەشی چوارەم
## پلان بۆ داهاتووت دابنێ و بگەڕێرەوە بۆ ئێستات

گرنگترین و بەنرخترین کار چییە کە ئەنجامی دەدەیت، لە هەر بوارێك و پیشەیەکدا؟ بیرکردنەوەیە! تواناکەت بۆ بیرکردنەوەیەکی ڕوون سەبارەت بەوەی چی دەکەیت و چۆن ئەنجامی دەدەیت، کاریگەرییەکی یەکجار گەورەی هەیە لەسەر دەرەنجامەکانی داهاتووت زیاتر لە هەر کارێکی دیکە.

چەند بوارێك هەن لە کارەکەتدا کە تیایدا "بیرکردنەوەی هێواش" زۆر گرنگ و پێویستە، بۆ ئەوەی بتوانیت باشترینەکانت ئەنجام بدەیت.

هەموو ڕۆژێك سی خولەك یاخود زیاتر تەرخان بکە بۆ ئەوەی پێداچوونەوە بۆ پلان و ئامانج و ڕەوتی بەرەوپێشچوونەکانت بکەیت. باشترین و گونجاوترین کات بۆ ئەنجامدانی ئەم پێداچوونەوەیە، یەکەم شتێکە لە بەیانیاندا. کاتت تەرخان بکە بۆ بیرکردنەوە، پلاندانان، بەدیهێنانی خەون و ئاواتەکانت. هەموو جێبەجێکارو خاوەنکارە کارامەکان لە ژنان و پیاوانیش، هەموو ڕۆژێك کاتیان تەرخانکردووە بۆ ئەوەی بە وریاییەوە ئەو شتانە پەیڕەو بکەن کە دەیانەوێت ئەنجامی بدەن بەر لەوەی

دەستبەکار بن. پێویستە بەرلەوەی دەستبەکاربیت بخوێنیتەوە، بیربکەیتەوە و پێداچوونەوە بۆ ئەو شتانە بکەیت کە دەتەوێت ئەنجامیان بدەیت.

بە درێژایی چەندان ساڵ، ژیاننامەی سەدان ژن و پیاوی سەرکەوتووم لە هەموو بوارەکاندا، خوێندۆتەوە.

یەك سەرەداوی هاوبەش لە هەموو ژیاننامەکاندا کە بۆم دەرکەوت ئەوەبوو کە شکۆداری ڕاستەقینە تەنها بە پێشبینی کردن، بیرکردنەوەو تەنهایی بوون بەدیدەهێنرێت.

شکۆمەندی تەنها بەوە بەدەست دێت کاتێك بە بەردەوامی کات تەرخان دەکەیت بۆ ئەوەی بیربکەیتەوە سەبارەت بەوەی کە کێیت، چیت دەوێت، وە باشترین ڕێگا بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی دەتەوێت چییە؟

کاتت وەربگرە تاوەکو هەڵسەنگاندن بۆ ژیان و چالاکییەکانت بکەیت لە شوێنێکی گەورەتردا. بیر لەوە بکەرەوە کە لە کوێیت ئەمڕۆ وە لە پێنج ساڵی داهاتوودا دەتەوێت بە کوێ بگەیت. سەیری ئەو کارو چالاکیانە بکە کە خەریکی ئەنجامدانیانیت ئەمڕۆ، وە کام یەکێك لەو چالاکیانە گەورەترین کاریگەری لەسەر داهاتووت دەبێت دیاری بکە. ئەم ڕێگە شێوازەی بیرکردنەوە یارمەتیت دەدات کە بە باشترین شێوە کاتەکەت بەڕێوە ببەیت زیاتر لەوەی کە تەنانەت دەتوانیت لە ئێستاتدا بیری لێبکەیتەوە،

هەندێکجار، تەنها یەك بیرۆکە کە لە ماوەی تەنهایتدا بە دەستی دەهێنیت دەکرێت بتپارێزێت لە کارکردنی سەخت و بەردەوامی چەند مانگ و ساڵێك.

### دیدی درێژخایەن

دکتۆر ئێدوارد بانفیلد لە زانکۆی هاڤارد زیاتر لە پەنجا ساڵ لێکۆڵینەوەی لەسەر ڕەوشت و ڕەفتاری کەسانی ئاست بەرزکردووە، لە هەردوو ئەمریکا و سەرانسەری جیهانیشدا.

یەکێك لەو خاسیەتانەی کەسانی بەجێهێنەری ئاست بەرز لە کەسانی ئاست نزم جیادەکاتەوە ئەوەیە کە پێی دەوترێت "دیدی درێژخایەن" بانفیلد ئەوەی بۆ دەرکەوت کە ئەنجامدەرە ئاست بەرزەکان کاتیان پێویستە بۆ ئەوەی دوورتر بیر لە داهاتوویان بکەنەوە، زۆرجار دە بۆ بیست ساڵی داهاتوویان، وە بە تەواوی ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە لەو کاتەدا دەیانەوێت لە کوێدا بن لە ژیان و کارەکەیاندا. لە پاشان دەگەڕێنەوە بۆ کاتی ئێستایان وە دڵنیا دەبن لەوەی کە هەموو ئەو شتانەی لە ئێستادا ئەنجامی دەدەن هاوتایە لەگەڵ ئەوەی کە دەیانەوێت لە داهاتوودا لەکوێ بن.

ئەمە شێوازێکی باشە کە بتوانیت بەکاریبهێنیت. پڕۆژە بۆ یەك، دوو یاخود سێ ساڵی داهاتوو دابنێ، وە

وێنای ئەوە بکە کە ژیانت لە هەموو لایەنێکەوە نموونەییە. وێنەیەکی ڕوونی هزری بۆ بارودۆخی کارەکەت بکێشە کە چۆن دەبێت ئەگەر هەموو شتێك بە تەواوی و بێکەموکورتی بڕوات بەڕێوە. لەم خاڵەی لە پێشەوە بوونی داهاتوودا، سەیری دەوروبەرت بکەو باسی ژیان و کارە نموونەییەکەت بکە، پاشان، لە خۆت بپرسە کە ئایا ئەوەی لە ئێستادا ئەنجامی دەدەیت هاوتایە لەگەڵ دروستکردنی داهاتووە نموونەییەکەتدا.

لەو خاڵەی کە تێیدایت، بگەڕێوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئێستا لێتی، وە ئەو هەنگاوانە ببینە کە پێویستتە بیاننێیت تاوەکو بەو شوێنەت بگەیەنێت کە دەتەوێت بۆی بچیت: "ئەم گەڕانەوە لە بیرکردنەوە لە داهاتووە" مەشقی زۆرینەی جێبەجێکارە مەزن و ئاست بەرزەکانە.

### لە ئێستادا بڕیاری باشتر بدە

بۆ نموونە، ئافرەتێکی لاو بڕیاری ئەوە دەدات کە دەیەوێت لە داهاتوودا ببێتە کەسێکی زۆر سەرکەوتوو لە کارو بازرگانیدا، بەهۆی ئەم دیدە درێژ خایەنەوە لە هزردا، ئەوا تاکەکە بۆ ماوە چەند کاتژمێرێك زیاتر کۆشش دەکات تاوەکو نمرەیەکی باش بەدەستبهێنێت و لە زانکۆ بەشێکی باش وەربگرێت. لە زانکۆش، کەسەکە کۆرسی زیاتر

دەبینێـت و زۆر زیـاتر دەخوێنێـت لـە هـەموو هاوڕێکـانی دیکەی تاوەکو ببێتە یەکێك لە یەکەمەکانی بەشەکەی.

لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششی چەند ساڵەو وازهێنان لە ئاهـەنگ و وەرزش و ژیـانی کۆمەڵایـەتیی کەسـەکە بـە ئاسـتێکی بـاڵا لـە زانکـۆ دەردەچـێت و لەلایـەن کۆمپانیایـەکی گـەورەوە کـاری پێـدەدرێت، کـە دەرفـەتی ئەوەی دەبێت زۆر زیاتر بەدەست بهێنێت لە هاوپۆلەکانی دیکەی کە هەرگیز بیریان لە داهاتوویان نەکردۆتەوە.

کاتێك دڵنیا دەبیت لەوەی کە دەتـەوێت لـە داهاتوودا بـە کـوێ بگـەیت، ئـەوا زۆر ئاسـانتر دەبێـت بـۆت تـاوەکو لـە ئێستادا بڕیاری باش و دروست بدەیت.

یاساکە ئەوەیە کە دیدی درێژخایەن برەو بە بڕیـاردانی کـورت خایـەنت دەدات، ڕەنگـە ئـەم وتەیـەت بیسـتبێت کـە دەڵێت:"ئەگەر نەزانیت بۆ کوێ بڕۆیـت، ئـەوا هـیچ ڕێگایـەك ناتگەیەنێتە ئەوێ".

خـووی بـرەودان بـە دیـدی درێژخایـەن زۆر گـرنگ و بەهێزە. بە پڕۆژە دانان بۆ داهـاتوو، وە پاشـان گەڕانـەوە بۆ ئێسـتات، هەمیشـە ئـەو هەنگاوانـە دەبینیـت کـە پێویسـتە بیانـنێیـت، وە ئـەو هەڵانـەش کـە پێویسـتە لێـی دوور بکەویتەوە. ئەم مەشق و ڕاهێنانە واتلێدەکات کە بەهاکانت بۆ ڕوون و ئاشکرا بێتەوە. هۆکار و ئامرازت پێدەبەخشێت بـۆ ڕێکخسـتنی کـات و چـالاکییەکانی کـە ئـەمڕۆ ئـەنجامی

دەدەیت و جوڵاندنت بە ئاراستەی دروستکردنی داهاتووە نموونەییەکەت.

## ئامادەبە بۆ شێوازەکانی بەڕێوەبردنی کات

ئەگەر بە ئاراستەی مەبەستە ویستراوەکەت نەجوڵێیت، ئەوا ناتەوێت بە هیچ جۆرێک پێی بگەیت، ئەگەر بە ئاراستەی بنیادنانی خودیت نەجوڵێیت، ئەوا هیچ خاڵێک نابێت لە بەڕێوەبردنی کاتەکەتدا بە جۆرێک کە خێرای بەدەستهێنانەکانت زیاد بکات.

ئەو ڕێگە شێواز و هۆکارانەی بەڕێوەبردنی کات کە ئەنجامی دەدەیت، بەبێ هەبوونی دیدێکی ڕوون بۆ داهاتووت ئەوا دەتگەیەنێت بە جێگایەک کە هیچ خۆشییەکی تێدا نییە بۆت.

هەرکاتێک کە بە تەواوی دڵنیابوویت سەبارەت بە نرخ و بەهاکانت، دیدگاکانت، پیشە و ئەرکەکانت، بۆ ژیان و کارەکەت، وە هەروەها تەواو ڕوون و ئاشکرا بوویت سەبارەت بەوەی دەتەوێت چی بەدەست بهێنیت و کامە باشترین ڕێگایە بۆ بەدەستهێنانی ئەوا ئەو کاتە، تەنها ئەو کاتە، دەتوانیت دەست بکەیت بە ئەنجامدانی چەند ڕێگەو شێوازێکی بەهێزی بەڕێوەبردنی کات کە بەردەستن بۆت.

# بەشی پێنجەم
## بەرنامەو پلانی نوسراو دابنێ

هەموو ڕێکخەرە سەرکەوتووەکانی کات، پلاندانەری باشن، هەمیشە لیستێك دروست دەکەن بۆ بە ئەنجام گەیاندنی هەر ئامانجێکی سەرەکی و لاوەکی. هەر کاتێك پرۆژەیەك دێتە سەر مێزەکەی بەردەستیان، کاتێکی تەواو تەرخان دەکەن بۆ ئەوەی بیر لەو شتانە بکەنەوە کە بە تەواوی دەیانەوێت بە ئەنجامی بگەیەنن وە لە پاشان لیستێکی ڕێکوپێك پێکدەهێنن کە هەموو هەنگاوە پێویستەکانی بەئەنجام گەیاندنی پرۆژەکە یەك لە دوای یەك لەخۆدەگرێت.

ئەمە یاسایەکە هەر خولەکێك کە لە بەرنامەدانانەدا بەسەری دەبەیت، دە خولەك خێراتر کارەکەت بە ئەنجام دەگەیەنێت، ئەو کاتەی کە تەرخانی دەکەیت بۆ بیرکردنەوە لە شتێك لەسەر کاغەز، بەرلەوەی دەست بەکارەکە بکەیت، ئەوا لە بەرامبەردا لەسەدا هەزار توانای کەسیت پێدەدات، وە لە هەر خولەکێك دە خولەکت بۆ دەگەڕێتەوە لە بەرنامەدانان بۆ کارەکەت لە یەکەم هەنگاوی دەستبەکاربوونتدا.

هەر کە ئامانجەکەت بۆ دەرکەوت، دەستبەجێ لیستێك پێکبهێنە لە هەموو ئەو شتانەی کە بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە پێویستە، بەردەوام بابەت و بڕگەی دیکە بۆ لیستەکەت زیادبکە لە کاتی بیرکردنەوەدا هەتاوەکو لیستەکە دەگاتە کۆتایی. لیستەکەت بە دوو شێوە ڕێك بخە: بە شێوەی یەك لەدوای یەك، وە بە شێوەی لەپێشێتی (کام کارە گرنگترە ئەوەیان لەپێشتر دابنێ).

یەکەم/ لە ڕێکخستنی یەك لەدوای یەکدا لیستێك لە چالاکییەکان دروست بکە بەپێی کات و ڕووداني کارەکان. لە یەکەم هەنگاو هەتا کۆتا هەنگاو بەر لە تەواوبوونی پرۆژەکە. هەروەك هێنری فۆرد دەڵێت: "گەورەترین ئامانج دەکرێت بەدەست بهێنرێت ئەگەر بتوانیت بیکەیت بە پارچەو بەشی بچوکتر".

دووەم/ لەپیشێتی بۆ بڕگەو بابەتەکان دابنێ، وا دابنێ کە لەسەدا بیستی ئەو بڕگانەی لە لیستەکەدان لە سەدا هەشتای بەهاو گرنگی هەموو ئەو شتانە دیاری دەکات کە ئەنجامیان دەدەیت.

دانانی لەپێشێتی وات لێدەکات کە جەخت لەسەر گرنگترین ئەرك و چالاکییەکانت بکەیتەوە بەبێ ئەوەی سەرقاڵ بیت بە کاری دیکەوە.

وەك "گۆتی" دەڵێت: "ئەو شتانەی کە زۆر گرنگن هەرگیز نابێت لەدوای ئەو شتانەوە بن کە کەمتر گرنگن".

بە بەردەوامی پێداچوونەوە بۆ پلانەکانت بکە، بە تایبەتیش لە کاتی هەر جۆرە نائومێدی و بەرهەڵستییەکدا. ئامادەکار بە بۆ ئەوەی بە پلانەکانتدا بچیتەوە کاتێک زانیاری یاخود پێڕاگەیاندنەوەیەکی نوێت پێدەگات. لەبیرت بێت، کە لانی کەم هەموو جۆرە پلانێک کەم و کورتی هەیە، بچووک بێت یاخود گەورە. بە بەردەوامی بەدوایاندا بگەڕێ. کاتێک ڕۆژانە پێداچوونەوە بۆ بەرنامەو پلانەکانت دەکەیت، ئەوا بیرۆکە و بەرچاوڕوونی زیاترت بۆ دێتە پێش سەبارەت بە تەواوکردنی ئەرکەکەت بە شێوەیەکی باشتر و خێراتر لەوەی کە پێشتر بیرت لێدەکردەوە.

کارکردنی بێ پلان هۆکارە بۆ هەموو شکستێک. بەدووربە لە فریودانی خۆت بەوەی کەدەستبەکار بیت بەر لەوەی پلانێکی باش دابنێیت.

## پلاندان بۆ دەستکەوتنی ئامانج

گرنگترین وشە کە پەیوەست بێت بە سەرکەوتنەوە بە هەموو جۆرەکانییەوە بریتییە لە ڕوونی و ئاشکرایی. کەسانی سەرکەوتوو تەواو ڕوون و ئاشکران سەبارەت بەوەی کە کێن وە چییان دەوێت لە هەموو بوارەکانی ژیانیاندا. سەرەڕای ئامانجە نوسراوەکانیان، کەسانی سەرکەوتوو پلانی نوسراوی کارەکانیشیان هەیە کە هەموو ڕۆژێک ئەنجامی دەدەن.

هەر کاتێک ئامانجێکی گەورەتر بۆ خۆت و بازرگانییەکەت دادەنێیت ئەوا چوار پرسیار هەیە کە پێویستە بیانپرسیت:

١- ئەو بەربەست و ئاستەنگیانە چین کە لەنێوان تۆو بەدەستهێنانی ئامانجەکانتدا وەستاون؟ بۆچی هەتا ئێستا بە ئامانجەکانت نەگەشتوویت؟ چی شتێك ڕێگری لێتکردووە؟ چی شتێك لەسەر ڕێگاکەت وەستاوە؟ ئەو کێشەو گرفتانە چین کە دەبێت چارەیان بکەیت و ئەو ئاستەنگیانە چین کە دەبێت بەسەریاندا زاڵ بیت بۆ گەیشتن بە کۆتایی و ئامانجەکەت؟

بۆ هەموو ئەو گرفتانەی کە پێویستە چارەسەریان بکەیت، ئەو لەسەدا بیستەی کێشەیە کامەیە کە چارەسەری لەسەدا هەشتای ئەو بەربەستانە دەکات کە لەنێوان تۆو ئامانجەکەتدایە؟

٢- ئەو زانیاری و کارامەییە زیادانە چین کە پێویستن بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکەت یاخود بۆ تەواوکردنی پرۆژەکەت؟ هەمیشە ئەم قسەیەت لەبیربێت "ئەوەی گەیاندویتی بە ئەمڕۆ بڕی پێویست نییە بۆ ئەوەی بتگەیەنێتە شوێنێکی دوورتر".

لە کوێ دەتوانیت ئەو زانیاری و کارامەییە زیادانە بەدەست بهێنیت کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەت پێویستتە؟

ئایــا دەتوانیــت زانســت و زانیــاری بکڕیــت یــا خود بــەکرێی بگریــت؟ ئایــا پێویســتت بــەوە هەیــە کــە پەرەبــە بــەهرەی نــوێ لــە خۆتــدا بــدەیت بــۆ ئــەوەی هــەموو توانــا شــاراوەکانت لــە کارەکەتــدا بەدەســت بهێنیــت؟ چــی زانیارییــەك زۆر گرنگــە بــۆت لــە بڕیــاردانی دروســتدا و لــە پڕۆسەی بەدەستهێنانی ئامانجەکەت؟

٣- ئــەو کــەس و کۆمــەڵ و دامەزراوانــە کامانــەن کــە پێویستیت بە هاوکاریەکانیان و یارمەتیدانەکانیان هەیە لە گەشــتن بــە ئامانجەکەتــدا؟ هەنــدێکجار، تاکــە کەســێك دەتوانێت بیرۆکە و بەرچاو ڕوونــی تــەواوت پێبدات یا خود دەرگا بە ڕووتدا بکاتەوە، یارمەتیت بدات بۆ بەدەستهێنانی زۆر زیاتر لەوەی کە چاوەڕێت دەکرد.

بە هــەمان هۆکار زۆرێك لە کەسە بازرگانــەکان دەچنە نێــو ململانــێ و هاوپــەیمانی ســتراتیژییەوە لەگــەڵ کێبڕکێکارەکانیانــدا بــۆ ئــەوەی بەرهــەم و خزمەتگوزارییــەك پێشکەشــی کڕیارەکانیــان بکــەن کــە تــاوەکو ئێســتا پێشکەشیان نەکردوون.

٤- لــە هــەموو ئــەو کەسانەی کــە دەتــوانن یارمــەتیت بــدەن لــە بەدەســتهێنانی ئامانجەکــەت، کــێ لــە هــەموویان گــرنگترە؟ دەتوانیــت چــی ببەخشــیت لــە هەمبــەر بەدەستهێنانی یارمــەتی و هاوکــاری کردنــی ئــەم کەســەدا

کەوا دەکات گرنگترین ئامانجت بە شێوەیەکی خێراتر بەدەست بهێنیت؟

گرنگترین پڕۆژە بازرگانیەکان و لە سەرانسەری جیهاندا، لەلایەن ئەو کەسانەوە تەواوکراون کە بەرنامەی درێژە پێدراویان هەیە بۆ کارەکانیان بەر لەوەی دەستبەکار بن. بەرنامەو پلانی نوسراو بۆ خۆت و کارەکەت دابنێ، و لە پاشان بە وردی بەدوای ئەو بەرنامانە بکەوە هەتاوەکو سەرکەوتوو دەبن.

# بەشی شەشەم
## ( هێڵکاری پرۆژەکانت بکێشە )

زۆرینەی کارەکان لە بازرگانیدا بریتییە لە زنجیرەیەک پرۆژە. تواناکەت بۆ بەئەنجامگەیاندنی پرۆژەکانت، بە تەواوی سەرکەوتنەکانت لە کارەکەتدا دیاری دەکات. پرۆژە بە "کاری هەمەجۆر" ناسراوە. پرۆژە ئەو سەرەنجامەیە کە لە تەواوکردنی زنجیرەیەک کاری بچووکتر بەدەستی دەهێنیت.

ڕەنگە بەهێزترین هۆو ئامرازێک کە بتوانیت بەکاری بهێنیت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بەدەستهێنان و کارامەیت بریتی بێت لە "لیستی پێداچوونەوە". لیستی پێداچوونەوە پێکدێت لە زنجیرەیەک هەنگاوی نوسراو کە بە شێوەیەکی یەک لە دوای یەک ڕێکخراون و لە پێشتر دروستت کردووە بۆ دەستبەکار بوونت لە یەکەم شوێندا.

تواناکانت بۆ دیاریکردن و پێناسەکردنێکی ڕوونی ئەو هەنگاوانەی کە بۆ بەئەنجامگەیاندنی پرۆژەیەکی سەرکەوتوو پێویستتە، هێما و نیشانەن بۆ بیرکردنەوەیەکی بەرزو شایستە.

جارێکی دیکە، یاساکە ئەوەیە کە هەر خولەکێک لە بارنامەدانان بۆ دروستکردنی لیستی پێداچوونەوەکانت

بەسەری دەبەیت ئەوا دە خولەکت بۆ دەگەڕێنێتەوە و خێراتر کارەکەت بەکۆتا دەگەیەنێت. کە ئەمەش نموونەیەکی دیکەیە بۆ بیرکردنەوەی لەسەرخۆ کە دەکرێت بە شێوەیەکی بەرچاو چالاکی و دەرەنجام و بەها بنچینەییەکانی بازرگانیەکەت زیاد بکات.

## هێلکارییەك دروست بکە

هێلکارییەکی بینراوی ئەرك و پڕۆژە گەورەکانت بکێشە کە بەهۆیەوە خۆت و ئەوانی دیکەش بتوانن هەموو پڕۆژەکەی تێدا ببینن.

بەو مەبەست و ئامانجانە دەست پێبکە کە پێویستە بەدەستی بهێنیت بۆ ئەوەی خۆشی لە بەرهەمەکان و دەرەنجامەکانیان ببینیت. لە مێشکی خۆتدا بیر لە کۆتاییەکەی بکەرەوە. کاتی خۆت تەرخان بکە بۆ ئەوەی بە تەواوی روون بیت سەبارەت بەوەی کە ئامانجەکەت چۆن دەبێت ئەگەر بە باشترین شێوە بەئەنجام بگات. لە پاشان بگەڕێرەوە بۆ ئێستات. لیستێك پێکبهێنە لە هەموو ئەو هەنگاوە شیاوانەی کە پێویستە بیاننێیت لەو شوێنەی کە هەیت بۆ ئەو شوێنەی کە دەتەوێت ببیت.

چەندین شێواز و فۆڕمی هێلکاری بەردەستن کە دەتوانیت هەڵیانبژێریت و بەکاریان بهێنیت. یەکێك لەو شێوازانە پێی دەوترێت "هەڵسەنگاندنی بەرنامەکان و

پێداچوونەوەی شێوازەکان" کە ئەمەش پێکدێت لە هەموو ئەو کارانەی (هەنگاوانەی) کە پێویستە ئەنجامیان بدەیت و هەر یەکێك لەو کارانە پێویستە تەواو بکرێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی کۆتایت. ئەم ڕێگە شێوازە لەلایەن زۆرینەی کۆمپانیا و جێبەجێکارە سەرکەوتووەکانەوە بەکاردەهێنرێت لە سەرانسەری جیهاندا. ئەم هێڵکارییە چەندین ڕێگە شێوازی جیاوازت نیشان دەدات بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەرکەکەت بە کاریگەرییەکی زیاترەوە.

بۆ دروستکردنی هێڵکارییەکە، بۆ هەر یەکێك لە مەبەست و ئامانجەکانت، هێڵێك بکێشە بۆ بەرواری بەکۆتاهێنانی. هەموو هێڵکارییەکان لەسەر کاغەز بنوسە تاوەکو بتوانیت ئەوە ببینیت کە پێویستە کەی ئەو ئەرکانەت تەواو بکەیت و بەپێی خشتەکە هەموو ئەرکەکە بەئەنجام بگەیەنیت.

بە بیرکردنەوەو دروستکردنی هێڵکارییەکە لەسەر کاغەز، دەتوانیت کۆنترۆڵی هەموو ڕووداوە یەك لە دوای یەکەکان بکەیت. هێڵگەیەکت هەیە تاوەکو لەسەری بڕۆیت. وە هەروەها لیستێك کە پێکهاتووە لە زنجیرەیەك ئەرك کە دەتوانیت پێداچوونەوەیان بۆ بکەیت تاوەکو دڵنیا ببیتەوە کە لە کاتی خۆی و بە باشترین شێوە بەئەنجام دەگەن. بە بەکارهێنانی ئەم هێڵکارییە بەدوور دەبیت لە دواکەوتن لە

دوا مۆڵەتـەکان. هەمیشـە لـە لوتکـەی کـارو پڕۆژەکانتـدا دەبیت.

ئەگـەر پێویسـت بێـت کارێـك تـا کۆتـایی مانگەکـە بەئەنجام بگـات، ئـەوا دەتوانیـت تـا پـازدە یـاخود بیسـتی مـانگ ئـەنجامی بگەیـەنیت، مەگـەر بـارودۆخێکی لـەناکاو یـاخود کێشـەیەك ڕوویـدا. هەمیشـە یاسـای (مۆرفیـت) لـەبیربێت "هـەر شـتێك بـە هەڵـە ماتبێـت هـەر بـە هەڵـە دەڕوات".

جێبەجێکارە کارامەکان ئەگەری ڕوودانـی هـەر کێشـە، کۆسپ، دواکەوتن و شکستێك دەکەن لە بەئەنجام گەیانـدنی کارەکانیان لە کـاتی خـۆی و بەپێی خشـتەی کارەکـان. ئـەم ڕووداوانە شتی ئاساین و بەشێکن لە ژیانی بازرگانی.

کاری تۆ ئەوەیە کە خاڵە لاوازەکانی پڕۆژەکـەت دیـاری بکەیت و پاشان بەسەر هەموو ئەو کێشەو کۆسپانەدا زاڵ بیت کە دێتە پێشت. هەر کە بۆ یەکەمجار ئەم هێڵکاریـەت بـەکارهێنا، سەرسـام دەبیـت بـەوەی کـە چـەندە خێراتـر کارەکانت تەواو دەکـەیت و کێشـەو گرفتـەکان چـەندە کـەمتر دەبنەوە.

### ئامانجی ڕوون و ئاشکرا بۆ هەموو کەسێك دابنێ

دەتوانیت زیاتر بەدەست بهێنیت بە ئامـانجی ڕوون و نووسـراو بـۆ هـەر کەسـێکی بـەژداربووی پڕۆژەکـەت زیـاتر

لەوەی کە لە ڕێگەی گفتوگۆ و سەرنجدانەوە بەدەستی دەهێنیت ئامانجەکانت ڕوون، تایبەت، پێوانەکراو وە کات بۆ تەرخانکراو بکە. لەبیرت بێت ئەوەی کە کاتی بۆ تەرخان دەکەیت بە ئەنجام دەگات. ئامانجێك بەبێ کۆتا وادە، لە ڕاستیدا ئامانج نییە، بەڵکو تەنها قسەیەك و گوفتارێکە.

بۆ بەئەنجامگەیاندنی هەر مەبەست و ئامانجێك لە کارو پرۆژەکەتدا، پێویستە بەرپرسیارێتی ئەو کارە بدەیت بە دەست کەسێکی تایبەتەوە، کێ پێویستە ئەم ئەرکە ئەنجام بدات؟ پێویستە کەی وە چۆن ئەرکەکە تەواو بکرێت؟ هەمیشە ئەم پرسیارانە بکە، هەرگیز وای دامەنێ کە هەموو کەس دەزانن کە چیت دەوێت مەگەر بە تەواوی ویستەکانت ڕوون بکەیتەوە بۆیان.

جێنەراڵ مۆتۆر لەساڵی ٢٠١٢ تووشی شکست و مایەپوچییەکی گەورە بوو بە بڕی ٤,٩ ملیۆن دۆلار. دان ئاکیرسیۆنی سەرۆکی جێنەراڵ مۆتۆرس دەڵێت، کە گرنگترین بەشی کاری کۆمپانیاکە دانانی ئامانجی ڕوون بوو بۆ هەر کەسێك لە هەر ئاستێکی دامەزراوەکەدا. بەر لەوەی ببێتە بەڕێوەبەری دامەزراوەکە، ئەوەی بۆ دەرکەوت کە ئامانج و مەبەستەکانی دامەزراوەکە نادیار و ناڕوون، ناچاری نەبوون وە زۆر بە دەگمەن بەدەستدەهێنران. بەڵام لە پاش دانانی ئامانجی تایبەت و ڕوون و ئاشکرا، هەموو

فەرمانبەرەکان زانیان کە دەبێت چی بکەن تاوەکو کارەکەیان و کۆمپانیاکەیان بەرەوپێش ببەن.

لەبیرت بێت، بەهێزترین و گەورەترین بەهرەیەک کە هەتبێت هێزی بیرکردنەوەیە. هەتا کاتی زیاتر تەرخان بکەیت بۆ بیرکردنەوەو بەرنامەدانان لەسەر کاغەز، ئەوا دەرەنجامی باشتر بەدەست دەهێنیت و خێراتر بە ئامانجەکانت دەگەیت.

## بەشی حەوتەم
## لیستی کردارەکانی ڕۆژانەت دروست بکە

ڕەنگە بەهێزترین ئامرازی کات ڕێکخستن، لیستێك بێت لە کارو چالاکییکانی ڕۆژانەت، کە دروستی دەکەیت بۆ نەخشەکێشانی ڕۆژەکەت.

هەموو کات ڕێکخەرە سەرکەوتووەکان، لەسەر کاغەز بیردەکەنەوەو کار بە لیستی چالاکییەکانی ڕۆژانەیان دەکەن. هەروەك فڕۆکەوان پێش هەر گەشتێك لیستەکەی بەکاردەهێنێت، جێبەجێکارە کارامەکانیش تەنها پێویستیان بە چەند خولەکێکە بۆ ئەوەی لیستی کارەکانی ڕۆژانەیان دروست بکەن بەرلەوەی دەستبەکار بن.

باشترین کات بۆ دروستکردنی لیستەکە شەوی پێشترە، هەر بەم هۆیەوە هەستی بە ئاگایت دەستبەکار دەبێت لەسەر لیستەکەت کاتێك نووسیتوویت. کاتێك بەیانیان لەخەو هەڵدەستیت، هەمیشە بیرۆکەو بەرچاو ڕوونیت هەیە کە یارمەتیدەرت دەبن لە بەدیهێنانی هەندێك لە ئامانجە گرنگەکانی لیستەکەت.

لە کۆتایی هەر شەوێکدا و کۆتا شت کە پێویست بێت ئەنجامی بدەیت دانانی بەرنامەیەکە بۆ ڕۆژی داهاتووت. لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە زیاتر لە پەنجا جێبەجێکاری

سەرکەوتوو و کارامە بەژداریان کردبوو، چل و نۆ لە پەنجایان وتیان کە باشترین شێوازێك بۆ کات ڕێکخستن هەیان بووە بریتی بووە لە نووسینی هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئەنجامی بدەن لە سەر کاغەزێك بەر لەوەی دەستبەکار بن لەو ڕۆژەدا.

## باشتر بنوو

زۆرێك لە خەڵکی لە شەودا هەمیشە لە دڵەڕاوکێ و ئەملاولا کردنداں، لە هەوڵدان بۆ ئەوەی ئەو شتانەیان لەبیر نەچێت کە پێویستە سبەی ئەنجامی بدەن. بەڵام ئەگەر بەر لەوەی بچیتە سەر جێگای نووستن لیستی کارەکانی سبەینێت ئامادە کردبێت و هەموو ئەو کارانەت نووسیبێت کە دەتەوێت ئەنجامیان بدەیت، ئەوا زۆر باشتر خەوت لێدەکەوێت و بەیانیانیش بە ئاسوودەیی و مێشکێکی سافەوە بەخەبەر دێیت.

بەپێی قسەی شارەزایانی بواری کات ڕێکخستن، هەموو ڕۆژێك تەنها دوازدە خولەکت پێویستە بۆ نووسینی لیستی هەموو ئەو کارو ئەرکانەی ئەو ڕۆژە دەتەوێت ئەنجامی بدەیت، بەڵام ئەم لیستە دە هێندە کاتی داهێنانت زیاد دەکات. دوازدە خولەك کە لە دروستکردنی لیستی ڕۆژانەدا بەسەری دەبەین (١٢٠) سەد و بیست خولەکت یاخود دوو کاتژمێر لە داهێنانت بۆ دەگەڕێنێتەوە.

## شێوازەکانی أ ب ج د هـ

هەر کە لیستەیەکت پێکهێنا لەو شتنەی کە دەتەوێت ڕۆژی داهاتوو بە ئەنجامیان بگەیەنیت ئەوا لیستەکەت بە شێوازی ا ب ج د ه ڕێکبخە.

گرنگترین وشە لە کات ڕێکخستندا بریتییە لە سەرەنجام. ئەرکێك گرنگە بە پشتبەستن بەسەرەنجامەکانی ئەنجامدان یاخود ئەنجام نەدانی، کاتێك تۆ لە پێشێتی بۆ کارەکانت دادەنێیت ئەوا ئەم ڕێسایە بۆ هەموو ئەرکەکانت جێبەجێ دەکەیت، وە هەمیشە بەو ئەرکانە دەست پێدەکەیت کە گەورەترین سەرەنجامیان هەیە، ئەمەش ئەو کاتەیە کە شێوازی (ا ب ج د هـ) زۆر یارمەتیدەر و بەسوود دەبێت.

سەرەتا بە دروستکردنی لیستەی کارەکانی ڕۆژی داهاتووت دەستپێبکە، پاشان لە تەنیشتی هەر بابەتێك لە لیستەکەدا پیتێك لە (أ ب ج د ه) دابنێ بەر لەوەی دەست بەکاربکەیت.

ئەو بابەتەی کە بە پیتی (أ) هێماکراوە شتێکە دەبێت ئەنجامی بدەیت و شتێکی گرنگە کە زنجیرەیەك لە سەرەنجامی هەیە ئەگەر ئەنجامی بدەیت یاخود ئەنجامی نەدەیت. پیتی (أ) لە تەنیشت هەموو ئەو ئەرك و چالاکیانەوە دابنێ کە دەبێت ئەنجامی بدەیت لەمیانەی

ڕۆژەکەتدا ئەگەر پێویست بێت بەرپەرسیاریەتیەکانت تەواو بکەیت.

(ب) ئەو شتانەن کە پێویستن بەئەنجام بگەیەنرێت، سەرەنجامی ئەنجامدان و ئەنجامنەدانی ئەرکی (ب) مامناوەندە لە گرنگیدا بەڵام ئەوەندەی ئەرك و چالاکیەکانی (ا) گرنگ نین.

یاساکە ئەوەیە کە نابێت هەرگیز ئەرکێکی (ب) ئەنجام بدەیت لە کاتێکدا ئەرکێکی (ا) تەواو نەکراو هەیە.

(ج) ئەو چالاکیانەن کە خۆشن بۆ ئەوەی ئەنجامیان بدەیت بەڵام ئەمانە سەرەنجامێکی ئەرێنی یاخود نەرێنیان نییە. قسەکردن لەگەڵ هاوپیشەکانتدا، خواردنەوەی کوپێك قاوە، و خوێندنەوەی نامەو ئیمەیڵەکانت ئەمانە چەند چالاکییەکی خۆش و چێژبەخشن بەڵام ئەنجامدان و ئەنجام نەدانیان هیچ دەرەنجامێکی کاریگەری نابێت بۆ کارەکەت.

## کارە تێکدەرو کات بە فیڕۆدەرەکان

ڕۆبەرت هاڵفی نێودەوڵەتی مەزەندەی دەکات کە لەسەدا پەنجای کاتی کارکردن لە چالاکییەکانی (ج)دا بەسەر دەبرێت، ئەو شتانەی کە هیچ گرنگییان بۆ کارو بازرگانییەکان نییە.

هەموو کەسێك دروستکەری خوون، کەسانی کارامە خووی باش و گرنگ دروست دەکەن و دەیانکەن بە

سەرداری خۆیان. کەسانی ناکارامە بەردەوام خووی خراپ دروســـت دەکـــەن، وە ئـــەم خـــووە خراپانـــە ژیانیـــان بەڕێوەدەبات.

زۆرێك لە خەڵکی خوویان گرتووە بەوەی کە دێنە سەر کارو دەستبەجێ دەست دەکەن بە چالاکییە کەم بەهاکان یـاخود بـەفیڕۆدانی کـات. هــەر کــە گەیشـتنە شـوێنی کارەکـەیان یـەکێك دەدۆزنـەوەو بـۆ ئـەوەی قسـەی لەگـەڵ بکەن، دەست دەکەن بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەو سەیرکردنی ئیمەیڵـــەکانیان و خواردنـــەوەی قـــاوەو بەســـەربردنی ڕۆژەکەیان.

هـەر شـتێك کـە بـەردەوام ئـەنجامی بـدەیت دەبێـت بـە خـوو. بەداخـەوە کـە زۆرینـەی خـەڵك لەسـەر کـار خـووی بەفیڕۆدانی کاتیان لەو چالاکییانەدا هەیە کە هیچ گرنگی و نرخێکـی بـۆ خۆیـان و بازرگانیەکەشـیان نییـە. هـەرگیز مەهێڵە ئەم خووە لە تۆدا دروست ببێت.

گەڕانەوە بۆ شێوازی (أ ب ج د ه)، چالاکی (د) شتێکە کە دەتوانیت بە کەسێکی دیکە ئەنجامی بدەیت، یاساکە ئەوەیـە کـە شـتێك بـدەیت بـە کەسـێکی دیکـە کـە بتوانێـت ئەنجامی بدات بۆت تاوەکو کـاتی زیـاتر فەراهـەم بکـەیت بۆ ئەوەی خەریکی چالاکییەکانی (أ) بیت. چالاکییەکانی (أ) و ســەرکەوتووانە بەئـەنجام گەیانـدنیان، تێکـڕای کۆرســی کارەکەت دەستنیشان دەکات.

چالاکی (هـ) ئەو شتەیە کە پێویستە لایببەیت، لە پاش هەموو ئەمانە، دەتوانیت جڵەوگیری کاتەکەت بکەیت، ئەگەر بوەستیت لە ئەنجامدانی هەموو ئەو شتانەی کە پێویست نییە ئەنجامی بدەیت.

ئەوە شتێکی ئاسایی و سروشتییە کە خەڵك لەمیانەی کارو چالاکییەکانیاندا بچنە ناوچەی ئاسوودەییەوە، دڵخۆش و ئاسوودە دەبن بە ئەنجامدانی چالاکییەکی دیاریکراو بە شێوازێکی دیاریکراو، تەنانەت لە دوای ئەوەی بەرپرسیارێتییەکی زیاتریشیان پێدەدرێت، بە بەردەوامی دەگەڕێنەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە ئیدی گرنگ نین، یاخود کەسانی دیکە دەتوانن وەك ئەمان یاخود باشتر لە ئەمان ئەنجامی بدەن.

لە خۆت بپرسە "چی دەبێت ئەگەر ئەو چالاکییە ئەنجام نەدەیت؟" ئەگەر جیاوازییەکی کەم یاخود هیچ جیاوازییەکی دروست نەکرد بۆ کارو پیشەکەت، ئاوا پێویستە دوور بکەویتەوە لە ئەنجامدانی ئەو چالاکییە.

### پلان بۆ کارەکانت دابنێ و کار بە پلانەکانت بکە

هەرگیز کارێك مەکە کە لە لیستەکەتدا نییە، ئەگەر ئەرکێکی نوێ یاخود پرۆژەیەك بەدیار کەوت، ئەوا لە لیستەکەتدا بینوسە و لە پێشێتی بۆ دابنێ بەر لەوەی دەست بەکارکردن لەسەری بکەیت.

ئەگـەر بیرۆکـەکان و چـالاکییەکانت نەنووسـیت وە لـەبری ئـەوە خـەریکی وەڵامدانـەوەی خواسـتە نەوەستێنراوەکانت بیت، ئەوا زۆر بە خێرایـی جڵەوگیری بەسەر ڕۆژەکەتدا لەدەست دەدەیت و لە کۆتاییدا زۆربەی کاتەکانت بەسەر دەبەیت بەو کارو چالاکییانەوە کە هیچ بەهاو نرخێکیان نییە بۆت.

هـەموو سیسـتمێکی ڕێکخسـتنی کـات باشـترە لـە نەبوونی سیستمی کات ڕێکخستن. چەندین بەرنامە هەن کە یارمەتیـدەرت دەبـن لـە کـات و ڕێکخسـتن دا. چـەندین سیستمی کات ڕێکخستن هەن کە دەتوانیت دایبەزێنیتە نێو کۆمپیوتەرەکەتـەوە. دەتوانیـت ئـەو سیسـتمانەی کـات ڕێکخسـتن بـەکاربهێنیت کـە دەتوانیـت لـەناو مۆبایلەکەتدا هەڵی بگریت و بەردەوام نوێکەری تێدا بکەیت.

تـەنها لـەبیرت بێـت کـە لـە جیهـانی کارکردنـدا تـەنها شتێك کـە پێویسـتە بیفرۆشیت کاتەکەتـە. هـەر لەبەرئـەوە دڵنیابـەرەوە لـەوەی کـە جـەخت لەسـەر گـرنگترین و بەبەهاترین کارەکان بکەیتەوە کە بتوانیـت ئـەنجامی بدەیت و جیاوازییەکی گەورە لە کارەکەتدا دروست بکات.

## لیستی ئەو شتانەی کە ئە نجامیان نادەیت

هـەرەك چـەندە پێویسـتت بـە لیسـتی ئـەو شـتانەیە کە ئەنجامیان دەدەیت بۆ ئەوەی وەك ڕێنیشـاندەرێك بێـت بـۆت

بە درێژایی ڕۆژەکەت، پێویستت بە لیستی ئەو شتانەش هەیە کە ئەنجامیان نادەیت تاوەکو یارمەتیدەرت بێت لەسەر مێلگەی خۆت بمێنیتەوە. ئەمە ئەو شتانەن کە بڕیارت داوە ئەنجامیان نەدەیت.

هەروەك نانسی ڕیگان دەڵێت: "تەنها بڵێ نەخێر!" تەنها بڵێ نەخێر بۆ ئەو چالاکییانەی کە نرخ و گرنگییەکی زۆریان نییە بۆت.

"نەخێر" گەورەترین وشەیە بۆ بەفیڕۆنەدانی کات لە جیهانی بەڕێوەبردنی کاتدا. هەر کە یەکجار ئەم وشەیەت بەکارهێنا ئەوا ئاسان و ئاسانتر دەبێت بۆ دووبارەکردنەوە.

لەبیرت بێت کە خەڵکی گەورەترین بەفیڕۆدەری کاتن کاتێك کەسێك داوات لێدەکات کە بتوانیت کارێکیان بۆ بکەیت یاخود یارمەتیەکیان بدەیت بە شێوەیەك لە شێوەکان ، ئەوا لە خۆت بپرسە "ئایا ئەمە کاتێکی گونجاوە، هەر ئێستا؟".

ئەگەر وەڵامەکەت نەخێر بوو ئەوا دەتوانیت لە وەڵامدا بڵێیت "زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەوەی پرسیت، با کەمێك بیری لێبکەمەوە و سەیرێکی خشتەی کارەکانم بکەم، دواتر دەگەڕێمەوە و پێتدەڵێم کە بتوانم یارمەتیت بدەم یاخود نا".

دەتوانیت بیست و چوار کاتژمێر چاوەڕێ بکەیت، پاشان پەیوەندی بەو کەسەوە بکەو پێی بڵێ کە، زۆر بە

داخەوە پێویستە لە دوامۆڵەتی خۆیدا کارەکەم بە کۆتایی بگەیەنم و ناتوانم یارمەتیت بدەم. سوپاسی ئەو کەسە بکە بۆ ئەوەی داوای یارمەتی لێکردووی، وە بڵێ "ڕەنگە جاری داهاتوو" کاتێکی بۆ تەرخان بکەیت.

لەبیرت بێت دەتوانیت جڵەوگیری کارەکەت بکەیت تەنها ئەگەر بوەستیت لە ئەنجامدانی شتە کەم بەهاکان. کاری زۆر زیاترت هەیە کە بتوانیت تەواوی بکەیت. هەرگیز واز لە ئەرك و بەرپرسیارێتییە هەنوکەییەکەت مەهێنە، واز لە هەر ئەرك و بەرپرسیارێتییەکی زیادە بهێنە کە ڕەنگە ڕۆژانە بێتە پێشت و لەبری ئەوە بڵێ: "نەخێر" بە بەردەوامی و بە خێرایی بیڵێ لەم کاتەدا ئەوا هەموو کاتەکانت لەژێر جڵەوی خۆتدا دەبن بە تەواوی.

## لە پێشێتی ڕوون و ئاشکرا دابنێ

بۆ ماوەی زیاتر لە سێ ساڵ لێکۆڵینەوەم لەسەر بەڕێوەبردنی کات کردووە، سەدان کتێب و بابەتم لەسەر ئەم بوارە خوێندۆتەوە، گوێم لە بەرنامەی دەنگی بێشومار گرتووەو بەژداری چەندین کۆڕو کۆبوونەوەم کردووە. هەموو ئەو بیرۆکانەم بەکارهێناوە کە کۆمکردبوونەوە، کتێبم لەسەر ڕێکخستنی کاتەکانی خۆم نوسییوە کە باشترین و پڕفرۆشترین کتێبەکانی جیهانن، چەندین بەرنامەی دەنگی و ڤیدیۆیم بەرهەم هێناوە و لە زۆرینەی

وڵاتانی جیهانیش دا کۆڕو کۆبوونەوەم لەسەر بەڕێوەبردن کات ئەنجام داوە.

ئەوەی کە خستوومەتە ڕوو وە بۆم دەرکەوتووە شتێکی زۆر ئاسان و سادە بووە: هەموو ڕێکخستنەکانی کات بۆ ئەوەن کە یارمەتیدەرت بن تاوەکو گرنگترین ئەرکت دیاری بکەیت کە دەتوانیت لە ئێستادا ئەنجامی بدەیت، وە پاشان هۆکارو شێوازی گونجاوت پێبدات تاوەکو دەستبەجێ دەستبەکار بیت لەگەڵ ئەو ئەرکە و بەم هۆیەوە دەتوانیت بەردەوام بیت لە کارکردن هەتاوەکو بەئەنجامی دەگەنیت.

شێوازی (أ ب ج د ه)م لە کۆتا بەشەکاندا باسکردووە. ئەم شێوازە یەکێکە لە هەرە شێوازە باش و بەهێزەکانی ڕێکخستنی پێشینەییەکانت. وە چەندین شێوازی دیکە هەن کە دەتوانیت بۆ دانانی لەپێشێتییەکانت بەکاریان بهێنیت.

## ڕێساکەی پاریتۆ

لە ساڵی ١٨٩٥دا ئابووری ناسی ئیتاڵی (ڤیلفیردۆ پاریتۆ) بۆی دەرکەوت کە یاسای ٨٠/٢٠ دەکرێت بەکاربهێنرێت بۆ پارەو کۆکردنەوەی سامان لە هەموو کۆمەڵگایەکدا. لە پاش چەند ساڵێك لە توێژینەوە بۆی دەرکەوت کە لەسەدا بیستی تاکەکان و خێزانەکان

کۆنترۆڵی لەسەدا هەشتای سامانیان کردووە لە هەموو شوێنێکی ئەورووپادا.

یاسای ۲۰/۸۰ دەکرێت بەسەر هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤدا جێبەجێ بکرێت، بە تایبەتیش ئەرك و بەرپرسیارێتییەکان. ئەوەی کە لەسەدا بیستی ئەو کارەی ئەنجامی دەدەیت هەژماری لەسەدا هەشتای بەهای هەموو ئەو کارە دەکات کە ئەنجامی دەدەیت.

(پیتەر درەککەر) دەڵێت کە یاساکە (۱۰/۹۰)یە. هەندێك جار لەسەدا دەی ئەو کارەی ئەنجامی دەدەیت هەژماری لەسەدا نەوەدی نرخی کارەکانت دەکات.

کاتێك رۆژانە بە لیستی ئەرك و بەرپرسیارێتییەکانت دەست پێدەکەیت بەرلەوەی دەستبەکاربیت، پێداچوونەوەیەکی خێرا بۆ لیستەکەت بکەو لەسەدا بیستی ئەو ئەرکانە دیاری بکە کە گەورەترین جیاوازی دروست دەکەن لە بەدەستهێنانیاندا. ئەگەر لیستەکەت لە دە بابەت پێکهاتبێت کە پێویست بێت بە ئەنجامیان بگەیەنیت ئەوا دووان لەو کارانە گرنگترو پڕبەهاتر دەبن لە هەموو ئەوانی دیکە.

تواناکەت بۆ ناسینەوەی ئەو دوو کارەو دەستبەکار بوون لەسەریان بە شێوەیەکی بەرفراوان سەرکەوتنت لە کارەکانتدا دیاری دەکات.

شێوازێکی دیکە کە لە ڕێکخستنی لە پێشێتییەکاندا دەتوانیت بەکاری بهێنیت بریتییە لە: دروستکردنی لیستی چالاکییەکانی ڕۆژەکەت پاشان لەخۆت بپرسە، "ئەگەر بێتوو بچمە دەرەوەی شار بۆ ماوەی مانگێک، وە لە بەیانیەوە دەستپێبکەم، ئەو چ کارو چالاکییەک لەو لیستەدا دەبێت لێی دڵنیا ببمەوە کە بە ئەنجامی بگەیەنم بەرلەوەی شار بەجێبهێڵم؟".

گەورەترین دوژمنی ڕێکخستنی کات و داهێنانە کەسییەکان لە ئەمڕۆدا بریتییە لە "ئەنجامدانی کارە لاوەکییەکان لەبری کارە سەرەکییەکان" بەهۆی مەیل و ئارەزووە سروشتییەکانی مرۆڤەوە، هەمووان سەرەتا دەیانەوێت ئەو ڕێگایە بگرنەبەر کە ئاسانترە و خێراتر دەگەن بە ناوچەی ئاسوودەییان. ئەمەش شتێکی ئاساییە بۆ خەڵکی کە لە کارە بچوک، ئاسان، چێژبەخش و ناگرنگەکانەوە دەست پێبکات هەموو ڕۆژێک. بەڵام بەداخەوە، هەر شتێك کە لە سەرەتاوە لەسەری دەستبەکار بوویت ئەوا دەبێت بۆ چەندین کاتژمێری دیکە پێوە سەرقاڵ بیت وە دواتر لە کۆتایی ڕۆژەکەتدا ڕەنگە بۆت دەربکەوێت کە هەموو کاتەکەت لە شتی بچووك و بێ مانادا بەسەر بردووە هیچ شتێکی بەبەهات بەدەست نەهێناوە.

## کارە گرنگەکان بەئەنجام بگەیەنە

ڕێگا شێوازێکی دیکە کە بتوانیت بەکاربهێنیت ئەوەیە کە وێنا بکە، بەیانی ڕۆژی دوو شەممە دێت بۆ سەرکار وە بەرپرس (خاوەنکارەکەت) لێت نزیک دەبێتەوە بە کێشەیەکەوە. ئەویش ئەوەیە کە خەڵاتی یەکەم گەشتی فڕۆکەی بۆ دەرچووە بۆ دوو کەس لە خۆشترین هاوینەهەوار، کێشەکەی ئەوەیە کە زۆرسەرقاڵە و ناتوانیت سوود لەم خەڵاتە وەربگرێت وە کاتەکەشی دیاریکراوەو دەبێت سبەینێ بەیانی بەکاربهێنرێت.

خاوەنکارەکەت ڕێکەوتنێکت لەگەڵ دەکات، ئەگەر بتوانیت هەموو کارە گرنگەکانت تەواو بکەیت تا کۆتایی ڕۆژەکە، ئەوا بلیتێکت پێدەدات و دەتوانیت بچیتە ئەو گەشتە سەرسوڕهێنەرە کە بە خۆڕاییە.

ئەگەر ئەم جۆرە هاندەرەت هەبێت، ئەوا چی دەکەیت؟ ڕەنگە سەرسام بیت بەوەی کە چەندە کار بە ئەنجام دەگەیەنیت بە تەنها لەو یەک ڕۆژەدا. وە ڕەنگە لەسەدا بیستی ئەو ئەرکانە تەواو بکەیت کە بۆ هەفتەیەک بەرنامە داڕێژیت بۆ کردووە.

کاتێک بەم جۆرە هاندەدرێیت، هیچ خولەکێك بەفیڕۆ نادەیت، بەهیچ جۆرێك کاتت نییە تاوەکو لەگەڵ هاوکارەکانت گفتوگۆ بکەیت. هەرزوو دەستبەکار دەکەیت و بە خێرایی لەماوەی کاتی چا خواردنەوە و نانی نیوەڕۆدا

بە مێشکێکی سافەوە، دەست دەکەیت بە پاککردنەوەی مێزەکەت و بەئەنجامگەیاندنی ئەرکە گرنگەکانت. دەبیتە داهێنەرترین کەسی ڕێکخراوەکەت بە تەنها لە یەك شەودا.

ئەمە ڕاهێنانێکی زۆرباشە تاوەکو مەشق لەسەر خۆت بکەیت. ئەم ڕاهێنانە ئەو ڕاستیانە ڕوون دەکاتەوە کە گرنگی و کاراییەکانت تەنها پەیوەستن بە هەڵبژاردنەوە. بە هاندەرێکی کاریگەر، سەرسام دەبیت کە چەندە داهێنەریت، وە بە بڕیاردان لەسەر بەشەکەی خۆت زۆر بە خێرایی دەبیتە یەکێك لە گرنگترین و بە بەهاترین کەسی دامەزراوەکەت.

( سێ یاساکە )

ئەم ڕێسایە دەکرێت گرنگترین بەش بێتلە خوێندنەوەی ئەم کتێبە. ئەمە لەو داهێنانە سەرسوڕهێنەرانەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەنجام داون لەماوەی چەندین ساڵدا و بە کارکردن لەگەڵ هەزاران بازرگان و جێبەجێکاردا. ئەویش ئەوەیە کە گرنگ نییە بە ماوەی هەفتەیەك یاخود مانگێك چەندین کاری جیاواز ئەنجام بدەین، تەنها سێ ئەرك و چالاکی هەن کە لەسەدا نەوەدی بەهای کارەکانت دیاری دەکەن کە بۆ بازرگانیەکەت ئەنجامی دەدەیت.

چۆن بتوانیت کە ئەو "سێ گەورەیە" دیاری بکەیت؟
زۆر ئاسانە، لیستێك پێکبهێنە لە هەموو کارو بەرپرسیارێتییەکانت، لە یەکەم ڕۆژی مانگەکەوە بۆ کۆتا ڕۆژ وە بە درێژایی ساڵ و پاشان وەڵامی ئەم سێ پرسیارە جادووییە بدەرەوە:

١. ئەگەر تەنها بتوانم یەك شت لەم لیستە ئەنجام بدەم بە درێژایی ڕۆژەکە، ئەوە کام چالاکییە دەبێت کە زۆرترین بەها بۆ بازرگانییەکەم دەستەبەر دەکات؟ گرنگترین ئەرکت... ئەو ئەرکەی کە گەورەترین جیاوازی دروست دەکات لە کارەکانتدا هەمیشە زۆر ڕوون و ئاشکرا دەبێت بۆت، وەك چۆن بۆ ئەوانەی دەوروبەریشت ڕوون و ئاشکرایە. ئەوا بازنەیەك بە دەوری ئەم بابەتانەدا بکێشە.

٢. ئەگەر تەنها بتوانم دوو شت لەم لیستەدا ئەنجام بدەم ئەوا دووەم چالاکی و کار چی دەبێت کە گەورەترین جیاوازی لە بازرگانیەکەمدا دروست دەکات؟ هەمیشە ئەم کارەش خۆی ڕوون و ئاشکرا دێتە بەرچاوت. ڕەنگە پێویستی بە کەمێك بیرکردنەوە هەبێت بەڵام هەمیشە ڕوون و دیارە.

٣. ئەگەر بتوانم تەنها سێ شت لەم لیستەدا ئەنجام بدەم بە درێژایی ڕۆژەکە، ئەوا سێیەم ئەرك و چالاکی کامە دەبێت کە زۆرترین نرخ و بەهای دەبێت بۆ کارو بازرگانیەکەم؟ کاتێك وەڵامەکانت شیدەکەیتەوە، بۆت

دەردەکەوێت کە تەنها ئەو سێ شتەی ئەنجامی دەدەیت ئەوا هەژماری نرخ و بەهاکانت دەکات. دەستکردن و بە ئەنجامگەیاندنی ئەم سێ ئەرکە لە هەموو شتێکی دیکە گرنگترە کە ئەنجامی دەدەیت.

ئەمە خاڵێکی گرنگە: ئەگەر وەڵامی ئەم سێ پرسیارەت نەزانی ئەوا بەڕاستی لە کێشەدایت. لە مەترسییەکی گەورەدایت و خەریکی بەفیڕۆدانی کات و ژیانی خۆتیت لە کارکرندا. ئەگەر وەڵامی ئەم سێ پرسیارە سیحراوییە نەزانیت، ئەوا هەمیشە کۆتایی کارەکانت چالاکی کەم بایەخ یاخود بێ بایەخ دەبێت.

ئەگەر هەر شتێکت لەلا ناڕوون و نائاشکرا بوو، بڕۆ بۆ لای خاوەنکارەکەت، بپرسە کە ئەو سێ شتە گرنگانە چین کە پێویستە ئەنجامی بدەیت تاوەکو جیاوازییەکی گەورە لە کارەکەتدا دروست بکەیت وە یاخود لە هاوپیشەکانت بپرسە. لە هاوسەرەکەت بپرسە، بەڵام هەر چیت کردووە دەبێت وەڵامی ئەم سێ پرسیارە بزانیت.

**بەردەوام بە لە گەیاندنی زانیارییەکانت**

هەر کە "سێ کارە گرنگەکەت" لا ڕوون بوو، ئەوا پێویستە تۆش یارمەتی هەموو ئەوانەی دیکە بدەیت کە داوای وەڵامی ڕوون دەکەن سەبارەت بە "سێ کارە گرنگە"کەیان. هیچ شتێك هێندەی ئەوە کارێکی باش نییە کە بتوانیت بۆ ئەندامانی دامەزراوەکەی ئەنجام بدەیت

بەوەی یارمەتیان بدەیت کە بتوانن گرنگترین ئەرکیان دیاری بکەن تاوەکو زۆرترین جیاوازی دروست بکەن بۆ بازرگانییەکەت.

لە بەش و دامەزراوە باش بەڕێوەبراوەکاندا فەرمانبەرەکان بە تەواوی دەزانن کە گرنگترین ئەو شتانە چین کە ئەنجامی دەدەن و گەورەترین جیاوازی بۆ ڕێکخراوەکەیان دروست دەکات لە هەمان کاتدا، هەموو خاوەنکارێك دەبێت بزانێت کە "سێ کارە گرنگە"کەی هەموو خاوەنکارەکانی دیکەش چین.

هەموو ڕۆژەکەو بە درێژایی ڕۆژ، هەمووان پێویستە کار بکەن، بە تەنها وە پێکەوەش، بۆ بەئەنجام گەیاندی یەکێك یاخود زیاتری ئەم سێ کارە گرنگە.

ئەو کەسانەی کە "بیرکردنەوەی خێرا" زاڵە بەسەریاندا، بە شێوەیەکی سروشتی و لەو کاتەدا وەڵام و بەرپەرچدانەوەیان هەیە بۆ هەموو فشارو خواستەکان. ئەم جۆرە کەسانە بە بەردەوامی لەسەر هێڵگەی خۆیان لادەدەن و دوور دەکەونەوە لە کارکردن لەسەر ئەرکە گرنگەکانیان.

بەڵام تۆ نابێت هەرگیز ئاوا بیت.

بەرلەوەی دەست بە کاربکەیت، هەندێك کات تەرخان بکە تاوەکو بە هێواشی بیربکەیتەوە و گرنگترین ئەرکت دیاری بکەیت، وە پاشان دەستبەکارکردن بکە لەسەر ئەو کارەو هەموو شتێکی دیکە وەلا بنێ.

# بەشی نۆیەم
# لەسەر هێلگەکەت بمێنەرەوە

"بەنرخترین بەکارهێنانی کاتەکانم چین لە ئێستادا؟"

لەبەرئەوەی ئەمە گرنگترین پرسیارە لە بەڕێوەبردنی کاتدا، بە بەردەوامی ئەم پرسیارە بکە هەتاوەکو دەبێتە ڕێنیشاندەرو هاندەرێکی لەخۆوە کە واتلێدەکات جەخت لەسەر گرنگترین ئەرك و چالاکیت بکەیتەوە.

کاتێك هەموو کاتەکانت ڕێك دەخەیت و کار لەسەر ئەو چالاکیانە دەکەیت کە لەدەوری ئەم پرسیارەن، ئەوا سەرسام دەبیت بەوەی کە چەندە خێرا دەبیتە کەسێکی بەبەرهەم و داهێنەر.

زۆربەی کات پرسیار لە ئامادەبووان دەکەم و دەڵێم "بە بەهاترین سەرمایەی دارایتان چییە؟"

لە دوای ئەوەی بیری لێدەکەنەوە، دوو وەڵام دەدەنەوە لە ڕاستیدا تێبینی ئەوە دەکەم کە وەڵامە ڕاستەکە "توانای بەدەستهێنانی داهاتە." تواناکەت بۆ بەدەستهێنانی پارە ڕێژی لەسەدا هەشتا بۆ لەسەدا نەوەدی بەهای دارایت دیاری دەکات لە جیهانی کارکردندا.

وەك ئامێرێکی بەدەستهێنان بیر لە خۆت بکەرەوە. هەر ئەرکێك کە کاری لەسەر دەکەیت بە جۆرێك لە جۆرەکان نرخ

و بەهای خۆی هەیە، زۆربێت یاخود کەم. کاری تۆ ئەوەیە کە جەخت بکەیتەوە لەسەر بەکارهێنانی کاتەکەت بە شێوەیەکی بە نرخ و خۆت ڕابهێنیت لەسەر ئەوەی بە بەردەوامی کار لەسەر ئەو چالاکیانە بکەیت کە نرخ و گرنگییەکی زۆریان هەیە بۆ کارو بازرگانییەکەت.

## ڕێسای شێوازی ژیانت

ئەم هەڵبژاردنی چۆنێتی بەکارهێنانی کاتەت، بەسەر هەموو بوارەکانی ژیانتدا جێبەجێ دەبێت. هەندێکجار و بەتایبەتیش کاتێك کارێکی زۆرت کردووەو زۆر هیلاکیت، باشترین کارێك کە بیکەیت ئەوەیە بچیتەوە ماڵەوەو خێرا بچیتە سەر جێگای نوستنەکەت و بەباشی بخەویت.

هەندێك جار باشترین بەکارهێنانی کاتەکانت ئەوەیە کە لەگەڵ کەسانی گرنگ بۆ ژیانت دابنیشیت و گفتوگۆی ڕووبەڕوو بکەیت و کاتیان لەگەڵ بەسەر ببەیت.

وە زۆرجاریش باشترین کاتێك کە بەسەری ببەیت ئەوەیە کە بە باشی ئاگات لە جەستەو تەندروستی خۆت بێت خواردنی باش بخۆیت و ڕاهێنانی بەردەوام بکەیت و پشووی تەواو بە جەستەت بدەیت و ئیسراحەت بکەیت تاوەکو بتوانین باشترین کار بەئەنجام بگەیەنیت.

هەندێکجار، باشترین بەکارهێنانی کات ئەوەیە کە کات لەگەڵ خێزانەکەت بەسەر ببەیت و کتێبی باش بخوێنیتەوە

نەوەك سەیری تەلەفزیۆن بکەیت. هەندێك کاتیش، باشترین بەکارهێنانی کاتت ئەوەیە کە پەیوەندی کۆمەڵایەتیت پتەوبکەیت و لەگەڵ خێزان و هاوڕێ نزیکەکانت کات بەسەر ببەیت و خۆشی لە کاتەکەت ببینیت و بحەوێیتەوە.

ئەوەی کە زۆر گرنگە بۆ تۆ ئەوەیە کە لە خۆت بپرسیت "باشترین بەکارهێنانی کاتەکانم چین لە ئێستادا؟" وە لە پاشان خۆت ڕابهێنە کە دەست بکەیت بە ئەنجامدان و بەکۆتاهێنانی ئەو چالاکیە، ئیدی هەرچیەك بێت، کاتێك دەستت کرد بە تێکەڵکردنی ئەم پێشنیارە لەگەڵ کارامەییەکانی بەڕێوەبردنی کاتەکانتدا ئەوا دەبیتە یەکێك لە ڕێکخەرە کارامەکانی بەڕێوەبردنی کات.

## ئەرکە گرنگەکە بەرامبەر بە ئەرکە بە پەلەکە

سەبارەت بە ئەرك و چالاکییەکانت، ڕێکخستنی پێشینەییەکان بە شێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە جیاکردنەوەی "کەمە گرنگەکە" لە "زۆرە ناگرنگەکە" چوار جۆری جیاواز لە ئەرك هەیە کە ڕۆژانە ڕووبەڕووی دەبیتەوە. بە تواناکەت بۆ ڕێکخستنی ئەم ئەرکانە بۆ جۆرە گونجاوەکانیان، دەتوانیت بە شێوەیەکی بەرچاو داهێنانەکانت زیاتر بکەیت وهەریەك لەم ئەرکانە دەکرێت بخرێتە چوارچێوە یاخود بازنەی جیاوازەوە.

## ئەرکی گرنگ و بە پەلە

ئـەرکی گـرنگ ئەرکێکـە کـە دەرەنجـامی درێژخایـەنی هەیە بۆ پیشەکەت. ئەرکی بەپەلە ئەو ئەرکەیە کە ناتوانیت دوای بخـەیت یـاخود خـۆتی لـێ لابـدەیت. ئـەو ئەرکـەی کە هـەم گـرنگ و هـەم بەپەلەیـە ئەرکێکـە کـە "مەحاڵـە بتوانیـت خۆتی لێ لابدەیت".

کە ئـەوەش بەشـێوەیەکی بەرچـاو لەلایـەن کاتەکـەت و داواکارییەکە دەرەکییەکانتەوە دیاری دەکرێت، بەو ئەرك و بەرپرسـیارێتییانەی کـە پێویسـتە دەسـتی پێبکـەیت و بـەکۆتایی بگەیـەنیت بـۆ ئـەوەی لـە بـەرزترین ئاسـتی کارەکەتدا بمێنیتەوە.

خـەڵکانێك هـەن کە پێویسـتە بیانبینیـت، شـێونگەلێك هـەن کـە پێویسـتە بـڕۆی بۆیـان، کڕیارانێـك هـەن پێویستە سـەردانیان بکـەیت، چـەند ئـەرکێك هـەن کـە پێویسـتە تـەواویان بکـەیت، وە چـەند چـالاکییەك کـە ئەوانـەی دیکە چـاوەڕێ دەکـەن جێبـەجێی بکـەیت (بەدەسـتی بهێنیـت) زۆرێك لە خەڵکی زۆرینەی کاتەکانی کارکردنیان بە ئـەرکێك بەسەر دەبەن کە هەم گرنگ و هەم بەپەلەشن.

گـرنگترین ئەرکـەکانت، بـەرزترین پێشـینەکانت هـەم گرنگ هـەم پێویستیشن ئەمـە پێـی دەوترێـت "چوارچێوەی خێرایی".

## چوارچێوەی دووەم: ئەو ئەرکانەی گرنگن بەلاّم بە پەلە نین

دووەم جۆری ئەرکەکان ئەوانەن کە گرنگن بەلاّم بەپەلە نین. ئەو ئەرکانە دەکرێت دوابخرێت، لانی کەم ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت.

نمونەیەك بۆ ئەو ئەرکەی کە گرنگە بەلاّم پێویست نییە، بەپەلە ئەنجام بدرێن وەك ئەو ڕاپۆرتەی کە پێویستە لە کۆتایی مانگەکەدا نوسرابێت، پەسەند کرابێت وە پێشکەش کرابێت یاخود بیرکردنەوە لە ئەرکەکانی وەرزی خوێندنی زانکۆت. ئەمە شتێکی گرنگە بۆ ئاست و نمرەکەت لە کۆتایی وەرزەکەدا، بەلاّم دەشکونجێت گەر دوابخرێت بۆ چەند هەفتە و مانگی دیکەو هەمیشە وا دەبێت (کە زۆرینەی ڕاپۆرت و توێژینەوەکان لە شەوێك پێش دوا مۆڵەتی ئەرکەکە دەنوسرێت. ئەوەی کە گرنگ بوو بەلاّم زۆر بەپەلە نەبوو دەستبەجێ دەگۆڕدرێت بۆ زۆر پێویست دەبێت بەپەلە ئەنجام بدرێت).

بە درێژایی ژیانت چواردەور دراویت بەو ئەرکانەی کە گرنگن بەلاّم پێویست نین خێرا ئەنجام بدرێن. خوێندنەوەی پەرتووکی گرنگ لە بوارەکەتدا، بینینی خولی زیاتر، بەهێزکردن و باشترکردنی کارامەیی و تواناکانت هەموو گرنگن بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنی درێژخایەن بەلاّم پێویست نین دەستبەجێ ئەنجام بدرێن. هەر لەبەرئەمەیە

ئەنجامدانی ئەو کارانە دوا دەخەیت. زۆرینەی خەڵکی کەم توانا یاخود شکستهاتوو دەبن لە کارو بازرگانییەکانیاندا بەهۆی دواخستنی باشترکردنی کارامەیی و تواناکانیانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر کە ئەمەش وادەکات بە ئاسانی تێپەڕێندرێن وە بکەونە پاش کەسانی بە ئیرادەو بەهەڵمەتی دیکەوە کە دەیانەوێت چێژی زیاتر و پاداشت و بەرپرسیارێتی مەزنتر بەدەست بهێنن.

هەروەك شتێکی سادەی وەك ڕاهێنانی جەستەی و وەرزشکردن زۆر گرنگە بۆ تەندروستیت بەڵام پێویست و بەپەلە نییە. دەتوانیت دوای بخەیت بۆ کاتێکی دیکە وە زۆرینەی خەڵکیش وا دەکەن، پزیشکەکان دەڵێن کە لەسەدا هەشتاو پێنجی کێشە تەندروستییە باوەکان کە لە گەورەبوون و تەمەنی پیری دا دەردەکەون دەیانتوانی لێی بەدووربن ئەگەر خویی گونجاوی تەندروستیان هەبووایە لە کاتی گەنجیاندا لەنێوانیشیاندا ڕیجیم (پارێز) کردن و وەرزشکردن گرنگترینیانن ئەم ئەرکانە دەچنە "نێو چوارچێوەی چالاکییەوە"

**چوارچێوەی سێهەم: ئەو ئەرکەی گرنگ نییە بەڵام پێویستە بە پەلە ئەنجام بدرێت**

ڕۆژانە چەندین کەس دێنە نوسینگەکەت، پەیوەندیت پێوە دەکرێت یاخود نامەو ئیمێڵت پێدەگات، بەڵام وەڵامدانەوەی ئەمانە کاتێکی کەمی پێویستە هیچ بەهاو

نرخێك نادات بە کارو پیشەسازییەکەت. ئەمانە ئەرکانێکن کە گرنگ نین بەڵام پێویست و بەپەلەن.

ئەمانــە هەمیشــە دەچــنە نێــو "بازنــەی هەڵــەبینین" خەڵکی وەها بیردەکەنەوە کە لەبەرئەوەی وابەستەی ئەم جۆرە چالاکیانەن لە ماوەی کاری ڕۆژانەیاندا ئەوا دەڵێن کە ئەم چالاکیانە دەبیت گرنگی خۆیان هەبێت بەڵام ئەمە تەنها خۆهەڵخەڵەتاندن و خۆدوورخستنەوەیانە لە کارەکانیان.

زۆرێك لە خەڵکی نیوەی کاتی کارکردنیان بەو چالاکی و کردارانەوە بەسەر دەبەن کە پێویستن بەڵام گرنگ نین.

ئەوانە چالاکی خۆش و ئاسان و چێژبەخشن بەڵام هیچ پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە کارەکەتەوە نییە. زۆرینەی ئەو چالاکییانە پێکدێت لە قسەو گاڵتەوگەپ لەگەڵ هاوکارو هاوپیشەکانیاندا وە یاخود چالاکی بێ بەهاو کەم نرخن.

**چوارچێوەی چوارەم: ئەرکی نا پێویست و ناگرنگ**

چوارەم جۆر لە چالاکی کە خەڵکی لە کارکردندا ئەنجامی دەدەن ئەو ئەرکانەن کە نە گرنگن نە پێویست. ئەم چالاکییانە دەچنە نێو "بازنەی بەفیڕۆدانەوە".

زۆرێك لە خەڵکی ئەو چالاکیانە ئەنجام دەدەن کە هیچ نرخێکی نییە نە بۆ خۆیان وە نە بۆ کۆمپانیاکەشیان. خوێندنەوەی نامەو ئیمێڵ یاخود پەڕەی وەرزشی، بازاڕکردن لە ماوەی کارکردنی ڕۆژدا، وە پیاسەکردن و

ســوڕانەوە لــە مــاوەی چــاوپێکەوتنەکاندا و گــوێگرتن لـە ڕادیۆو گۆرانی ئەمانە هەموو نموونەن لەو چالاکییانەی کە گرنگن نە پێویست، بەڵکو بە تەواوی کاتبەفیڕۆدانن هیچ شتێك بۆ ژیانت دەستەبەر ناکەن.

## پەرەدان بە خووە باشەکانی کارکردن

گـەورەترین تراژیـدیا ئەوەیـە کـە ئەگـەر بـە بـەردەوامی شــتێك ئــەنجام بــدەیت ئــەوا تــۆ بــە زوویــی خوویــەك پەرەپێدەدەیت. وە خوویـەکیش کە لات دروست بوو ئیدی ئەســتەمە بتوانیــت وازی لێبهێنیــت. زۆرێــك لــە خــەڵکی پەرەدەدەن بە خووی بەفیڕۆدانی چالاکی کەم نرخ و بەهادا وە لـە پاشـان دا سەرسـوڕماو و حەپەسـاو دەبـن کاتێـك لـە کارەکــەیان دەردەکــرێن یــاخود پلــەیان بــەرز ناکرێتــەوە. کلیلەکـە بـۆ بـەڕێوەبردنی باشـی کـات بـۆ تۆیـە بـۆ ئـەوەی پێشینەییەکان دابنێیـت و هەمیشـە کـار لەسـەر چالاکییەك بکەیت کە هەم گرنگ هـەم پێویسـت بێـت. ئەمەیە گرنگترین و پێویستترین ئەرکەکانت. هـەر لەگـەڵ ئـەوەی دەستت کرد بەو ئەرکانەی کە گرنگ و پێویستن، دەستبەجێ دەستبکە بەو ئەرکانەی کە گرنگن بەڵام پێویست نین لـەو کاتـەدا. ئەو ئەرکانـەی کـە گـرنگن بـەڵام پێویسـت و بەپەلـە نین هەمیشە ئــەو ئــەرك و چــالاکیانەن کــە مانــاو گرنگــی دەدەن بــە پیشەکەت بۆ ماوەیەکی زۆر.

# بەشی دەیەم

## دەرەنجامی بوارە سەرەکیەکانت دیاری بکە

ڕەنگە گرنگترین کلیل بۆ داهێنان و وەبەرهێنانی مەزن بۆ تۆ بێت کە جەخت لەسەر بەبەهاترین و گرنگترین شتەکان بکەیتەوە کە بتوانیت بەدرێژایی ڕۆژ ئەنجامی بدەیت.

پەرەپێدانێکی تەواو و ورد سەبارەت بە دەرەنجامی بوارەکەت زۆر گرنگە و پێویستە بۆ چالاکی کاریگەرو داهێنانی مەزن. دەرەنجامی سەرەکی بوارەکەت ئەو شتانەن کە تۆ کرێگرتەی بۆ ئەنجامدان و پێشینەکانی کە دەیبەخشیت بە کارو پیشەسازییەکەت. ئەوانە ئەو ئەرکانەن کە هەر بەدەستت هێنان دیاری بکەیت یاخود نا، تۆ بەرپرسیارێتی خۆت بۆ خۆت و کۆمپانیاکەت فەراهەم کردووە. ئەو دەرەنجامە سەرەکیانەی بوارەکەت کامانەن کە تۆ بۆ بەدەستهێنانیان کرێگرتەی؟ هەوڵ بدە بە شێوازێکی دیکە پرسیارەکە بکەیت:

"بۆچی تۆ موچەت پێدەدرێت؟" ئەمە یەکێکە لەو کلیلی ڕێکخستنانەی کە پێویستە هەموو ڕۆژێك و هەموو خولەکێك لە خۆتی بپرسیت.. وە بەتایبەتی لە کاتێکدا کە

سەرسام دەبیت بەوەی دەبێت لە کاتێکی کەمدا ئەرکێکی زۆر بەئەنجام بگەیەنیت.

دەرەنجامە سەرەکییەکانی بوارەکەت دەکرێت بە هەبوونی سێ جۆری تایبەتمەند پێناسە بکرێت:

١. ئەو شتەیە کە پێویستە بە شێوەیەکی تەواو و ئەرێنییانە ئەنجامی بدەیت بۆ بەدیهێنانی خواست و بەرپرسیارێتی کارەکەت.

٢. ئەو شتەیە کە لەسەدا سەد لێی بەرپرسیاریت. کە ئەگەر خۆت بەئەنجامی نەگەیەنیت ئەوا هیچ کەسێکی دیکە ناتوانێت بۆت ئەنجام بدات.

٣. ئەو شتەیە کە بە تەواوی لەژێر جڵەوی خۆتدایە. وە تۆ هیچ پێویستت بە هاوکار و سەرپەرشتیار نییە بۆ ئەوەی ئەم بەشەی کارەکەت بەئەنجام بگەیەنیت.

ئەگەر بە تەواوی دڵنیانەبوویت کە دەرەنجامی سەرەکی بوارەکەت چییە ئەوا بڕۆ بۆ لای بەرپرسی کارەکەت و لێی بپرسە.

بپرسە "بۆچی، لەبەرچی، مووچە وەردەگرم؟".

ناخافڵیەکی تەواوە، زۆرینەی بەرپرس و خاوەن کارەکان نازانن کە چۆن وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە تەنانەت هەرگیز بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە بۆچی خۆشیان لە لیستی موچەدان و موچە وەردەگرن. کاتێك ئەم پرسیارە لە بەرپرسەکەت دەکەیت و ناچاری دەکەیت بیر لەم

پرسیارە بکاتەوە ئەوا دەبیتە کەسێکی زیاتر کاریگەر و دامێنەرتر دەبیت لە کارەکەتدا.

**لەسەر هێلگەکەت بەردەوام بە**

پرسیاری دووەم و بە لەبەرچاوگرتنی دەرەنجامی سەرەکی بوارەکەت ئەمەیە: "دەتوانم تەنها چی بکەم، ئەگەر بە باشی بەئەنجام بگات، ئایا ئەمە جیاوازی ڕاستەقینە بۆ دامەزراوەکەم دروست دەکات؟"

هەر کە ئەم پرسیارەت کرد، وەڵامێکی تایبەت و ڕاستەقینە هەیە بۆ هەموو کاتژمێرێک و هەموو ڕۆژێک لە کارەکەتدا، چەند شتێك هەن کە تەنها تۆ دەتوانیت ئەنجامی بدەیت. ئەگەر تۆ بەئەنجامی نەگەیەنیت ئەوا هیچ کەسێکی دیکە ناتوانێت بۆت ئەنجام بدات وە ئەگەر هاتوو بە شێوەیەکی باش ئەم کارانەت ئەنجام دا، ئەوا جیاوازییەکی یەکجار گەورە بۆ کارەکەی خۆت و کۆمپانیاکەشت دروست دەکەیت. ئەمانە ئەو چالاکییە تایبەتانەن کە گەورەترین نرخ و بەها دەدەن بە کارەکەت. بۆ ئەوەی باشترینەکان ئەنجام بدەیت، ئەوا پێویستە بە تەواوی ئەو چالاکییانە بزانیت کە گرنگیان لەوانی دیکە زیاترە و ئەوەش کە دەبێتە هۆی دروستکردنی جیاوازی بە بەئەنجام گەیاندنی.

لەبیرت بێت، هەمیشە سەدان شتی بچوکتر هەن کە دەتوانیت ئەنجامیان بدەیت و وە ئەگەر بە باشی بەئەنجامیش بگات ئەوا جیاوازی زۆر کەم دروست دەکەن بۆ سەرکەوتنت یاخود بۆ هاوبەشکردنەکانت.

جەختکردنەوە لەسەر دەرەنجامە سەرەکییەکانی بوارەکەت ڕێگایەکی ڕاستەوخۆیە بۆ دەرخستنی هێز و توانا، قایلکردن، پەرۆشی و کاریگەرییەکان. هەمیشە هەستێکی گەورەی باوەڕبەخۆبوون و کەسیت دەبێت کاتێك کارێك یاخود چالاکییەك ئەنجام دەدەیت کە گرنگە بۆ خۆت و کۆمپانیاکەشت.

لەلایەکی دیکەوە، لە کاتی سەرنج بەریدا، هەستێکی ڕێزی خودیی لاواز و دوودڵی و نائومێدیت دەبێت، هەمیشە خەمۆکیت کاتێك شتێك ئەنجام دەدەیت کە دەزانیت جیاوازییەکی زۆر بچوك دروست دەکات لە بەدەستهێنانی ئامانجە مەزنەکانتدا.

## پێناسەی دەرە نجامە سەرەکییەکانی بوارەکەت بکە

بە دەگمەن زیاتر لە پێنج بۆ حەوت دەرەنجامی سەرەکی بوارەکان هەیە لە هەموو پیشەیەکدا کە هەریەکێك لەمانە ئەرکێکی دیاریکراوە کە پێویستە ئەنجامی بدەیت ئەگەر بە گشتی بەرپرسیارێتییەکانی کارەکەت تەواو بکەیت.

بۆ نموونە ئەگەر کەسێکی فرۆشیار بیت ئەوا دەرەنجامە سەرەکییەکانی بوارەکەت ئەمانە دەبن:

١. دۆزینەوەی هەل و دەرفەت (وەك دۆزینەوەی کڕیاری نوێ و قسە بۆ کردنیان).

٢. دروستکردنی متمانەو پێدانی ڕاپۆرت بە کڕیارەکان تا وایان لێبکەیت ئامادەبن بۆ ئەوەی گوێت لێبگرن.

٣. دیاریکردنی هەموو پێداویستییەکان بە تەواوی.

٤. پێشکەشکردنی بەرهەمەکان بە شێوەیەکی کاریگەرانە.

٥. وەڵامدانەوەی بەرهەڵستییەکان بە ڕوونی و ئاشکرایی.

هەریەك لەم ئەرکانە پێویستە تەواو بکرێت بۆ ئەوەی وەك فرۆشیارێك لە کۆمپانیاکەت تەواوی بەرپرسیارێتییەکانت جێبەجێ بکەیت.

هەروەك وەك بەڕێوەبەریش پێنج بۆ حەوت دەرەنجامی سەرەکی بوارەکەت هەیە ئەوانیش:

١. بەرنامــەدانان (بڕیــاردان لەســەر ئــەوەی کــە چی بکرێت).

٢. ڕێکخســـتن (هـــەموو ئـــەو شـــتانەی کـــە بـــۆ جێبــەجێکردنی پلانــەکان پێویســتن پێکیــان بهێنیــت وەك سەرچاوەی پێویست، پارە وە خەڵکی).

٣. دامەزرانــدنی ئەنــدامی نــوێ (دۆزینــەوەی کەســی ڕاست و شیاو بۆ کارکردن و بەدیهێنانی ئامانجەکانت).

٤. ڕێنــوێنی کــردن (دڵنیابوونــەوە لــەوەی کــە خــەڵکی بزانن پێویستە چی بکەن و چ کاتێك وە لە چ ئاستێکدا بێت کارەکان).

٥. سەرپەرشــتی کــردن (دڵنیابوونــەوە لــەوەی کــە هــەر کارێــك بــەپێی خشــتەکەی جێبــەجێ بکــرێن و بــەپێی ئــەو کواڵیتییەی کە پێویستەو داواکراوە).

٦. پێوانــەکردن (دانــان و ڕێکخســتنی هەڵســەنگێنەرو ســـتاندارەکان لەگـــەڵ خشـــتەیەك بـــۆ ئەرکـــە گـــرنگ و بەدەستهاتووەکان).

٧. دروســـتکردن و نوســـینی ڕاپـــۆرت (دڵنیابوونـــەوە لـــەوەی کـــە هەرکەســێك لەســـەرو تـــۆوە، لـــە ئاســـتی تـــۆو لەخوارەوو خۆشتەوە بە تەواوی بزانیت کە ئەو شتەی تۆ چییە و چی دەکەیت و چیت بەدەستهێناوە).

زیاتر لە سەدا نەوەدی کێشەکانی بەڕێوەبردن و زیانت لە کەوتنی تۆپەکەتەوە لە یەکێك لەم دەرەنجامانەدایە. ئەمە وەك ئـەوە وایـە کـە یـەکێك لـە پێکهاتـە گرنگـەکانی خواردنەکەت وەلا بنێیت. وە بەم هۆیەشەوە خواردنەکە ئەو تام و چێژە خۆشەی نابێت کە دەتویست.

## ڕوونی و ئاشکرایی زۆر گرنگە

هـەموو کەسـێك لـە هـەر ئاسـتێکی بەڕێوەبردنـدا، پێویستە بزانێت دەرەنجامە سەرەکییەکانی چین. دڵنیابە لەوەی کە هەموو کارمەندەکان کە ڕاپۆرتت پێدەدەن تەواو ڕوون و ئاشـکرا بـن سـەبارەت بـە بـەهاترین و بـەنرخترین بەرهەم و هاوبەشـی پێکردنەکانی تر کە دەتوانن ئەنجامی بدەن بۆ دامەزراوەکەیان. گەورەترین یارمەتی کە دەتوانیت پێشکەشـی فەرمانبـەرەکانی بکـەیت ئەوەیـە کـە یارمـەتیان بـدەیت تـەواو ڕوون و ئاشـکرا بـن سـەبارەت بە بەهاترین و گرنگترین ئـەو شـتانەی کـە دەتـوانن ئـەنجامی بـدەن، وە لـە پاشان یارمەتیدەریان بیت لـە بەدەستهێنانی ئەم ئامانجانە لە کاتی خۆیدا.

کێشـــە نییـــە لـــە کـــوێ و لـــە چ ئاســـتێکی دامەزراوەکەتـــدایت. بۆیـــە هەمیشـــە پێویســـتە دوو شـــت بزانیـــت: یەکـــەم/ کلیلـــی دەرەنجامـــەکانی بـــواری بەڕێوەبەرەکـــەت چـــین؟ ئـــەو دەســـتکەوتانە چـــین کـــە

بەڕێوەبەرکەت پێویستە بەدەستی بهێنێت کە زۆر گرنگە بۆ سەرکەوتنت و پێشکەوتنی دامەزراوەکەت زیاتر لە هەر شتێکی دیکە؟

ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارانە نەزانیت، ئەوا ناتوانیت یارمەتی بەڕێوەبەرەکەت بدەیت لە تەواوکردنی کارەکەیدا، کە ئەمەش زۆر گرنگە بۆ سەرکەوتنی کەسیت.

دووەم/ پێویستە کلیلی دەرەنجامەکانی بوارەکەی خۆت بزانیت، سەرەڕای ئەوەش، هەرکەسێك کە ڕاپۆرت پێشکەشی تۆ دەکات دەبێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بزانیت سەبارەت بە تۆ. هەموو ئەوانەی کە لە چواردەورتن دەبێت بزانن کلیلی دەرەنجامی بوارەکانیان چین بۆ زانینی گرنگیان و زانینی ئەوەی پێویستە کەی کارەکانیان بەئەنجام بگەیەنن.

# بەشی یازدەیەم
## ( بریکاری کردن بۆ ئەوانی دیکە )

یەکێك لە گەورەترین ئامرازەکانی بەڕێوەبردنی کات بۆ تۆیە کە کەسێکی دیکە بدۆزیتەوە تاوەکو ئەرکەکەت بۆ تەواو بکات. تواناکەت بۆ ئەنجامدانی ئەرکە کەم بەهاکان بۆ کەسانی دیکە، ئەوانەی کە دەتوانن بە موچەو کرێیەکی کەمتر ئەنجامی بدەن، یەکێکە لە بەهرە گرنگەکانی بەڕێوەبردنی سەردەمیانە.

بۆ نوێنەریکردن و بریکاریکردنی هەموو ئەو شتانەی دەتوانی گونجاوانە ئەنجامی بدەیت بۆ کەسانی دیکە (ئەوانەی کە دەتوانن ئەرکەکان هەروەك تۆ یاخود باشتر لە تۆ بە ئەنجام بگەیەنن) یاسای "لەسەدا حەفتا" بەکاربهێنە. ئەگەر کەسێك توانی ئەرکێکی دیاریکراوی سەدا حەفتا وەك تۆ بەئەنجام بگەیەنێت، ئەوا کاری سەرەکی تۆ ئەوەیە کە لە ئاستی خۆت بێبێتە خوارەوەو بچیتە ئاستی ئەو کەسەی دیکە.

### چەندجارە کردنی نرخ و بەهاکەت

نوێنەری کردن و بریکاریکردن واتلێدەکات کە بجوڵێیت لە ئەو شتانەی کە دەتوانیت ئەنجامیان بدەیت بۆ ئەو شتانەی کە دەتوانیت بەڕێوەی ببەیت. نوێنەری کردن

ئـەو بەهرەیەیـە کـە واتلێـدەکات توانـاو کارامەییـەکانت بەرزبکەیتـەوە چـەند هێنـدەیان بکـەیت. هـەموو کەسێك دەتوانرێت بەشێکی کەمی کارەکەی پێبدرێت.

هەمیشـە هەڵبـژاردنت هەیـە دەتوانیـت خـۆت کارەکـە ئـەنجام بـدەیت، یـاخود دەتوانیـت کەسـێکی دیکـە بـۆت ئەنجام بدات، بەرزترین ئاستی بەدیهێنان هەمیشە پێویستت بە بیرکردنەوەیە لە پێشهاتەکانی دواتر: "کێی تر بێجگە لە من، دەتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات؟".

## بەڕێوەبردن شایستەی فێربوونە

فێـری بـەهرەی بـەڕێوەبردنی گونجـاو ببـە. (کتێبێکـی بچوکم نووسـی لەسـەر ئـەم زنجیرانـەی کـە هـەموو شتێکت پێـدەڵێن کـە پێویسـتتە بـۆ زانـین و گـەورەکردن و بەرەوپێشبردنی داهێنانەکانت لە رێگەی کەسانی دیکەوە).

کەسـی گونجـاو هەڵبـژێرە بـۆ ئەنجامـدانی هـەر ئـەرکێك دابینکردنـی خشـتەکان، دوا مۆڵەتـەکان، شـێوازە سەردەمیەکانی ئەنجامدان و خشتەی پێداچوونەوە.

هـەروەها دەتـوانین چارەسـەری کێشـەکان و دروستکردنی بڕیارەکـانیش بکـەیت ئەگـەر ئەمانـە بەشێك بـوون لـە کارەکـان و بەرپرسـیاریەتییەکانت. دەتوانیـت نوێنـەری کۆکردنـەوەی زانیـاری و لێکۆڵینـەوە بکـەیت.

دەتوانیت نوێنەری هەر ئەرکێك بکەیت کە هەر کەسێکی دیکە دەتوانیت وەك تۆ ئەنجامی بدەن.

بە هەبوونی بەهرەی نوێنەری کردن، کە یەکسەری فێری دەبیت، ئەوا هیچ سنورێك نابێت کە نەتوانیت پێی بگەیت لە پیشەگەرییەکەتدا. بەلام بەبێ توانای نوێنەریکردنێکی چوست و چاك، هەمیشە لە کۆتاییدا کاتێکی کەمت دەبێت بۆ ئەنجامدانی شتانێکی زۆر. شتی کەم نرخ و بەهات دەبێت تا ئەنجامی بدەیت. هەرگیز پلەت بەرز ناکرێتەوەو ناگەیتە لوتکەی کارەکەت. وە ئەمەش زیانێکی زۆر دەگەیەنێت بە کارو پیشەکەت.

هەواڵە خۆشەکە ئەوەیە کە هەموو بەهرەکانی بازرگانی دەکرێت فێرببیت. هەموو بیرۆکەکانی ئەم پەرتووکە ئەوەیە کە دەتوانیت ببیتە پێشەنگ بە مەشقکردن و دووبارەکردنەوەی شتەکان. دەتوانیت ببیتە باشترین لە بەڕێوەبردنی کاتەکەتدا و بەردەوام بیت لە دوو هێندەو سێ هێندەکردنەوەی داهێنانەکانت لە مانگەکان و ساڵەکانی داهاتوودا.

# بەشی دوازدەیەم
## جەختکردنەوە لەسەر یەکبیری

بیرکردنـــــەوەی ورد (هۆشـــــجەمی) و یەکدەســـــتی ســــەرەکیترین پێویســــتیەکانن بــۆ هـــەموو دەســـتکەوتە مەزنەکان. جەختکردنەوە واتای ئەوەی کە هەر دەستت کرد بە گرنگترین ئەرکت، ئەوا بەبێ سەرنج بەری و گاڵتەگەپ و کــات بەســـەربردن بــە ئــەنجامی بگەیــەنیت. تواناکــەت بۆ جەختکردنـەوە لەسـەر یـەك بیریکردنـەوە و لەسـەر گرنگترین بەکارهێنانی کاتەکەت یەکەم پێویستییە بۆ سەرکەوتنت.

دەکرێت هەموو پێویستییەکانی دیکەت هەبێت وەک لە زیرەکـی، بـەتوانایی و داهێنەرایـەتی، بـەڵام بـەبێ هـەبوونی جەختکردنــەوە لەســەر یــەك شــت لــە یــەك کاتــدا، ئــەوا ســەرکەوتوو نابیــت. پێویســتە شــتە یەکەمــەکان یەکــەمجار ئەنجام بدەیت یەك شت لە یەك کاتدا وە دووەم شت بە هیچ شێوەیەك. ئەگـەر خـۆت ڕانـەهێنیت لەسـەر جەختکردنـەوەو ئەنجامدانی یەك بیر لە یەك کاتدا، ئەوا بە شێوەیەکی نەگۆڕ دەمێنیتـەوە لـە کـارکردن لەسـەر ئەرکە کـەم لەپێشـینەکان و کەم بەهاکان.

هەمیشە کاتی تەواو بۆ لەپێشینەییە لوتکەییەکانت دابنێ. بیخەمڵێنە کە چەندە کاتت پێویستە بۆ ئەوەی کارەکە ئەنجام بدەیت پاشان لەسەدا سی وەك یەدەگێك دابنێ بە لە بەرچاوگرتن و حسابکردن بۆ پێشهاتە کتوپڕ و لەناکاوەکان و بەرپرسیارێتییەکان. بەو لەسەدا سییە یەدەگەی کاتەکەت زۆر نزیك دەبیتەوە لە خەملاندنی کاتی پێویست بۆ بە بەئەنجامگەیاندنی کارەکە. ئەوە یەکێکە لە نهێنییەکانی بەدیهێنانی داهێنانی ئاست بەرز لە کارەکەتدا.

ئێر نیکتنکل دەڵێت کە "هەموو ئەنجام و دەستکەوتە مەزنەکان بە جەختکردنەوەیەکی ماوە درێژ و بەردەوام بەدەست هاتووە".

## مەشقی تاکە کەسی بکە

کاری تاکەکەسی یەکێکە لە گرنگترین شێوازەکانی کات بەڕێوەبردن و بنەماکانی ژیان بەڕێوەبردن.

کاتێك دەست دەکەیت بە کارێك ئەوا لەگەڵی دەمێنیتەوە هەتا لەسەدا سەد بەئەنجامی دەگەیەنیت.

کاری تاکە کەسی پێویستی بەوەیە کە نابێت بەردەوام بیت لە هەڵگرتن و دانانی هەمان ئەرك دووبارە، ڕۆیشتن لە کارێك بۆ کارێکی دیکەو پاشان گەڕانەوە بۆ هەمان کار. لەگەڵ کاری تاکەکەسی هەر کە دەستت کرد بە ئەنجامدانی

ئەرکێك خۆت ڕابهێنە لەسەر ئەوەی کە کۆتایی بەم ئەرکە بهێنیت پێش ئەوەی بچیتە سەر ئەرکێکی دیکە.

بۆ وەڵامدانەوەی نامەو ئیمەیلەکانیشت کاری تاکەکەسی بەکاربهێنە. بابەتە ناگرنگەکان دیاری بکە دەستبەجێ و پاشان تەنها لەگەڵ بابەت و نوسراوە گرنگەکاندا مامەڵە بکە، و خێرا وەڵامیان بدەرەوە.

ڕێسای کاری تاکەکەسی لەلایەن شارەزای بەناوبانگی کات ڕێکخستن ئالان لاکین داهێنراوە بە لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنی کات و جوڵەو بەرهەم و دەرەنجامەکانی ئەو کەسانەی بیرکردنەوەی تاکەکەسی بەکاردەهێنن بە بەراورد لەگەڵ ئەو بەرهەم و دەرەنجامانەی کەسێك کە لەسەر ئەرکێك دەڕوات و دەگەڕێتەوە و دووبارە دەڕوات و دەگەڕێتەوە سەر ئەو ئەرکە لە ماوەی تەواوبوونی ئەرکێکدا. ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوە دەریخست ئەوە بوو کە هەر کاتێك کارێك وازلێدەهێنیت و دەچیتە سەر کارێکی دیکە، ئەوا گڕوتین و کێش لەدەست دەدەیت وە هەروەها ئەو شوێنەی کە ئەرکەکەت تێدا ئەنجام داوە بزر دەکەیت و لەدەست دەدەیت. کاتێك کە دەگەڕێیتەوە بۆ ئەرکەکە، ئەوا هیچ هەڵبژاردەیەکت نییە جگە لەوەی کە دیسانەوە پێداچوونەوە بۆ کارەکەی پێشووت بکەیتەوەو بگەیتەوە بە ئەو خاڵەی کە تێیدا بوویت، کاتێك دەستت لەم ئەرکە هەڵگرت و پاشان دەستت پێکردەوە، ئەم کردارە وا

بەردەکەوێت کە پێویستی بە لەسەدا پێنج سەدی ئەو کاتە هەبێت کە پێویستە بۆ ئەنجامدانی ئەرکێك کە ئەگەر لەگەڵ دەستپێکردنیدا بمایتایتـەوە هـەتا ئەرکەکـە لەسـەدا سـەد کۆتایی پێدێت.

بـە شـێوەیەکی ئاسـایی دەتـوانین بڵـێین یـەك بـیری و کاری یەکدەستی لەسەدا هەشتای کاتت بۆ دەگەڕێنێتـەوە بـۆ بـە ئەنجامگەیانـدنی ئـەرکێکی گـرنگ، لـە کۆتاییشـدا ڕێژەی باش بە ئەنجام گەیاندنی کارەکە زیاتر دەکات.

### دوورکەوتنەوە لە ئەنجامدانی دوو کار لە هەمان کاتدا

لـەم ڕۆژگـارەدا وتوویـــژی زۆر هــەن لەســـەر چـەمکی "هەمەکاری" هەندێك خەڵك وا بیردەکەنەوە کە لە ئاستێکی زۆر بـەرزی بـەڕێوەبردن و داهێنانـدان کاتێـك کـار لەسـەر چـەند ئـەرکێك دەکـەن لـە یـەك کاتـدا. لێکۆڵینـەوەکان لـە ئێستادا سەلماندوویانە کە ئەم بیرۆکەو بیروبۆچوونانە بە تەواوی هەڵەو نادروستن.

شـارەزایان بۆیـان دەرکـەوتووە کـە "هەمـەکاریی" لـە ڕاسـتیدا "گـۆڕینی ئەرکـە". ڕاسـتییەکە ئەوەیـە کـە تـەنها دەتوانیـت یـەك کـارە ئـەنجام بـدەیت لـە یـەك کاتـدا. ئەگـەر بوەستیت لە ئەنجامـدانی کارێك بۆ ئەوەی دەستبکەیت بە ئەنجامـدانی کـارێکی دیکـە، ئـەوا دەبێـت هـەموو وزەو هـزرو سەرنجت بگۆڕیت بۆ ئەرکە نوێیەکە وە کاتێك دەگەڕێیتـەوە

بۆ ئەرکی پێشووت، ئەوا زۆر بە سادەیی سەرنجت دەگۆڕێت هەروەك گۆڕینی تیشكی ڕووناکی لە ئامانجێکەوە "بۆ ئامانج و مەبەستێکی دیکە". لە پاشان دەبێت خۆت دووبارە (ئامادە بکەیتەوە) بۆ ئەوەی خێرا بگەڕێیتەوە سەر ئەرکە کۆنەکەت بەرلەوەی دەستپێبکەیتەوە.

## گێل و گێلتر

بەپێی زانیارییەکانی ئەمڕۆی ئەمریکا، هەر کاتێك واز لە کارێك دەهێنیت و دەچیتە سەر کارێکی دیکە وە پاشان گەڕانەوە بۆ هەمان ئەرکی پێشووت ئەوا بڕێکی زۆر لە وزەو چالاکی و زیرەکی هزرو مێشکت دەسووتێنیت. لە تەواو بوونی هەر ڕۆژێکی ئەرکی هەمە چەشنی دا، دەکرێت زیاد لە دە خاڵی ئاستی زیرەکیت لەدەست بدەیت. هەر بۆیە وردە وردە بە درێژایی ڕۆژەکە دەبییە کەسێکی حۆل و بێزار هەست بە نائارامی و بێئومێدی دەکەیت هەمیشە لە دڵەڕاوکێ و دوودڵیدا دەبیت سەبارەت بە بچووکترین شتەکانیش هەروەك ئەوەی کە چیت دەوێت بۆ ژەمە نانی ئێوارەت یاخود سەریکردنی "تەلەفزیۆن لە ئێوارەدا".

هەمەکاری فریودانە، بەڵام فێڵکردنە لە بەکارهێنانی کات. دەکرێت وێرانکەرێکی ڕاستەقینەی کارەکەت بێت و

لاوازکەری تواناکانت بێت بۆ ئەنجامگەیاندنی گرنگترین ئەو ئەرکانەی کە سەرکەوتنەکانتی لەسەربەندن.

### بڕیاری جەختکردنەوە لەسەر کارەکان بدە

هەر ئەمڕۆ بڕیار بدە کە بیکەیت بە خوویەک بۆ دانانی پلان و بەرنامەکانت بە وریاییەوە، دانانی لە پێشێتی وە لە پاشان دەست بکەیت بە کارکردن لەسەر گرنگترین ئەرکت. هەر جارێك دەستت کرد بە ئەنجامدانی گرنگترین ئەرك و بەرهەمت، بڕیار بدە کە کاری تاکە کەسی و بیرکردنەوی تاکەکەسی بکەیت، بەبێ دابڕان و دوورکەوتنەوە هەتاوەکو کارەکەت تەواو دەکەیت.

یەکێك لە شێوازەکانی کە لەلایەن ڕاپەڕێنەرە داهێنەرەکانەوە بەکاردەهێنرێت ئەوەیە کە لە ماڵەکەی خۆتدا کاربکەیت لە بەیانیان یاخود ئێوارانداوە یاخود لە کۆتایی هەفتەدا، لەو کاتەی کە دەتوانیت جەخت بکەیتەوە لە بەکارهێنانی یەکبیری و یەك کاری بەبێ هیچ جۆرێك لە هۆکارە کارتێکەرە وەستێنەرەکان.

هۆیەکی دیکە بۆ جەختکردنەوەو بەکارهێنانی بیرکردنەوەیەکی تاکەکەسی ئەوەیە کە دووربکەویتەوە لە "کارتێکەرە دەرەکییەکان" لەبری ئەوەی وەڵامی هەموو ئیمەیڵ و پەیوەندییە تەلەفۆنیەکان بدەیتەوە "ئەوا شتەکان بکوژێنەرەوە" دەرگاکەت دابخە، هەموو ئامێرەکان

بکوژێنەوەو هەموو شتەکانی دیکە وەلابنێ تاوەکو بتوانیت کار لەسەر ئەو ئەرکە بکەیت کە جیاوازییەکی یەکجار دیار دروست دەکات بۆ کارەکەت و کۆمپانیاکەت کاتێک ئەم هەنگاوانە پەیڕەو دەکەیت و دەیکەیتە خوویەک، ئەوا داهێنان و ئەنجامدان و سەرەنجامی باشی کارەکانت دوو هێندەو سێ هێندە دەکەیت بە درێژایی شەو.

## زاڵبوون بەسەر پشتگوێ خستن و کەمتەرخەمییەکاندا

هەر لە کۆنەوە وتراوە کە "پشتگوێخستن و کەمتەرخەمی دزی کات بووە". لە یەکێك لە کۆڕەکانمدا پیاوێکی ژیر ئەم وتەیەی درێژ کردەوە بە وتنی "پشتگوێخستن و کەم تەرخەمی دزی ژیانە".

تواناکەت بۆ زاڵبوون بەسەر پشتگوێخستن و کەمتەرخەمیدا و بەئەنجام گەیاندنی کارەکەت لە کاتی خۆیدا دەکرێت هەموو جیاوازییەك دروست بکات لە نێوان سەرکەوتن و شکستی کارەکەت دا.

هەرچۆنێك بێت، ڕاستییەکە ئەوەیە کە هەموو کەسێك کەمتەرخەمی دەکات. هەموو کەسێك ئیشی زۆری هەیە بەڵام کاتی کەم. بەڵام ئەی ئەگەر هەموو کەس کەمتەرخەم بێت ئەوا جیاوازی چییە لەنێوان بەرهەمهێنەرە ئاستبەرز و بەرهەمهێنەرە ئاست نزمەکاندا؟

زۆر سـادەیە، بەرهەمهێنـەرە ئاسـت بـەرزەکان کەمتەرخـەمی و پشـتگوێی کـارو چـالاکییە کـەم بـەها و ناگرنگـەکان دەکـەن، بـەڵام بەرهەمهێنـەرە ئاسـت نزمـەکان کەمتەرخەمی لە ئەرکێکدا دەکەن کە نرخ و بەهایەکی زۆری هەیە بۆ خۆیان و کۆمپانیاکەشیان.

بـۆ ئـەوەی گـەورەترین داهێنـان وبەرهـەمهێنان بکـەیت دەبێت بڕیار بدەیت کە ببیتە "کەمتەرخـەمێکی داهێنەرانە" لە ئێستا بەدواوە.

بە وریـایی و هۆشیارانە بڕیـار بدە کە چ جۆرە کارێك دوابخـەیت. سـەیری لیسـتی کـاری ڕۆژەکـەت بکـە وە ئـەو بابەتانـە دیـاری بکـە کـە بـەنیازی ئـەنجامیان نـەدەیت هـەتاوەکو ئـەو بابەتانـەی دیکـە تـەواو دەکـەیت کـە زۆر گرنگن. پێویستە زۆر بە وریایی و هۆشیارانە کار بکەیت بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی لەخۆوە و لەپڕ تووشی کەمتەرخەمی و پشتگوێخستن نەبیت.

ئێمە هەمیشە هەوڵدەدەین کەمتەرخەمی لە گەورەترین ئەرکمانـدا بکـەین کـە ئـەم ئەرکـە هەمیشـە بـە بـەهاترین ئەرکیشە بۆمان. لێرەدا زنجیرەیەك لە ڕێگاو شێواز هەن کە دەتوانیت بەکاریان بهێنیت تاوەکو بەسەر کەمتەرخەمی و پشتگوێ خستنەکانتدا زاڵ ببیت یاخود لانی کەم بتوانیت ڕێکیان بخەیت. لە ڕاستیدا، چەندین کتێبخانە هەن کە پڕن لە پەرتووك، یەك دوانێکیان لەلایەن مەنەوە نوسراون لەسەر

بابەتی کەمتەرخەمی و پشتگوێ خستن. ئەمانە چەندین بیرۆکەی باشن کە بیخوێنیتەوەو دەستبەکاربیت هەر ئێستا.

## بەرنامەسازی هزری

"ئێستا ئەنجامی بدە"

ئەمانە ڕەنگە بەهێزترین وشەکان بن کە دەتوانیت بەکاری بهێنیت بۆ زیادکردنی داهێنەریت هەر کاتێك هەستت کرد بە خۆت کە خەریکی کەمتەرخەمی لە کارێکی گرنگدا دەکەیت، ئەوا بە پەرۆشی و پڕ وزەوە بە خۆت بڵێ "ئێستا ئەنجامی بدە! ئێستا ئەنجامی بدە! ئێستا ئەنجامی بدە!".

سەرنجڕاکێشترین شت ئەوەیە کە لە دوای ئەوەی دە جار، بیست جار، یاخود تەنانەت سەد جار ئەم وشانە دووبارە دەکەیتەوە، ئەوا بە شێوەیەکی خۆنەویستانە هاندراو دەبیت تاوەکو لەسەر ئەو ئەرکە گرنگەت بمێنیتەوەو ئەو کارە تەواو بکەیت بەر لەوەی هیچ شتێکی دیکە ئەنجام بدەیت.

## تەواوکردنی ئەرکە گەورەترەکان

(هێنری فۆرد) نوسیویەتی "هەر ئامانجێك دەکرێت بەدەست بهێنرێت ئەگەر بەشی بکەیت بۆ بەشی بچووك بچووکتر".

هـەموو ئـەرکێکی گـەورە کـە پێویسـتە بەئـەنجامی بگەیـەنیت دەکرێـت تـەواو بکرێـت ئەگـەر بیکەیتـە بەشـی بچوك بچووکتر. یەك لە باشترینی هەموو ڕێگاکان ئەوەیە کە ئەرکەکەت بەش بکەیت بۆ "پارچەی قەبارە بچووك" پارچە کاغـەزێك بێنـەو هـەموو ئـەو بەشـە بچـووکانەی ئەکەکـەت بنووسە کە پێویستە بەئەنجامیان بگەیەنیت، بە شێوەیەکی ڕێکخراو و لەیەکەم کاری بچوکەوە بۆ کۆتا کار کە ئەرکەکە بەئەنجام دەگەیەنێت.

لە پاشان خۆت ڕابهێنە لەسەر ئەوەی کە کاری "ژمارە یەك" لـە لیسـتەکەتدا ئـەنجام بـدەیت. هەنـدێکجار، بڕیـاردان لەسەر ئەوەی هەنگاوی یەکەم بنێی لەسـەر ئـەرکێکی مـەزن، ئەوا زۆر بۆت ئاسانتر دەبێت کە هـەنگاوی دواتـر و دواتـر و دواتــریش بنێیــت. هەنــدێکجار زۆرکــردن لــە خــۆت بــۆ دەستکردن بە ئـەرکی سـەرەکیت یارمەتیدەرتـە تـاوەکو پـەرە بە گـوڕ و وزەی پێویسـت بـدات بۆ کـارکردن هـەتا ئەرکەکـە تەواو دەبێت.

### شێوازی پارچە گۆشتی بە بەهاراتکراو

جیـاوازی شـێوازی "پارچــەی قــەبارە بچــووك" بــۆ زاڵبــوون بەســەر کەمتەرخــەمی دا وەك "شـێوازی پارچــە گۆشـتی بــە بــەهاراتکراو" وایــە هــەروەك ئــەوەی کــە تــۆ ناتـەوێت پارچـەیەك گۆشـتی بـە بـەهاراتکراو بـە یـەك قـەپاڵ

بخۆیت، هەوڵنادەیت کە ئەرکێکی مەزن بەئەنجام بگەیەنیت لە ماوەی یەك کاتدا. لەبری ئەوە ئەرکەکە پارچە پارچە دەکەیت. قەبارەی ئەرکەکە بچووك دەکەیتەوەو پارچەیەکی بچوك لە یەك کاتدا وەردەگریت. وە پاشان بڕیار بدە کە ئەو پارچە بچووکە بە ئەنجام بگەیەنیت بەر لەوەی بچیتە سەر کارێکی دیکە.

هەموو کاتێك کە دادەنیشیت و خەریکی ئەرکە سەرەکییەکەت دەبیت وە بە تایبەتی ئەگەر نقوم ببیت لەگەڵ بەرپرسیارێتییەکان، ئەوا بڕیار بدە کە یەك بەش لە ئەرکێك بە ئەنجام بگەیەنیت لە یەك کاتدا. هەمیشە ئەم ڕێگە شێوازە یارمەتیت دەدات لەسەر دەستبەکاربوون لە پرۆژەکەتدا و وە ئاسانکاریت بۆ دەکات تاکو بەشەکانی دووەم و سێیەم و چوارەمیش بە ئەنجام بگەیەنیت.

## گەشەدان بە هەستی پەلەکردن و خێرا ڕاپەڕاندنی کار

یەکێك لە دەگمەنترین و پڕبەهاترین خاسیەتی مرۆڤ لە جیهانی کارکردندا بریتییە لە پەلەکردن و خێرا بەئەنجام گەیاندنی کار. مەزەندەی ئەوە کراوە کە تەنها لە سەدا دووی خەڵکی بە خێرایی جوڵە دەکەن تاوەکو کارەکانیان بەئەنجام بگەیەنن. کاتێك پەرە دەدەیت بە "ڕێکخستنی کارەکانت" و خێرا و بەزووترین کات کارەکەت بەئەنجام

دەگەیەنێت، ئەوە زۆر بە خێرایی بەرەوپێش دەچێت لە کارەکەتدا.

کاتێک پرسیار لە ٣٠٠ ئەفسەری پلەبەرز و خاوەنکار و کۆمپانیاکان کرا کە کارمەندەکان پێویستە چی بکەن تاوەکو ئاستی خۆیان لە کۆمپانیاکانیاندا بەرزبکەنەوە، لەسەدا هەشتاو پێنجی بەڕێوەبەر و بەرپرسەکان هەمان وەڵامیان هەبوو. دوو لە گرنگترین خاسیەتەکانی کە بە دوای دەگەڕان ئەمانە بوون:

١) توانای دانان و ڕێکخستنی پێشترینەکان

٢) توانای ئەوەی کە لە گرنگترین کارەوە دەستپێبکەیت بە خێرایی و بە باشترین شێوە کارەکە بە ئەنجام بگەیەنێت.

کاتێک دەست دەکەیت بە گرنگترین ئەرکت و زۆر بە خێرایی و بەباشی کارەکەت بە ئەنجام گەیاند، ئەوا زۆر خۆشحاڵ و سەرسام دەبیت بەو هەموو دەرفەتە سەرسوڕهێنەرانەی دێنە بەردەمت.

# بەشی چواردەیەم
## دروستکردنی بەربەستەکانی کات

پێویست بە بەربەستی کاتیی تەواو هەیە بۆ بەئەنجامگەیاندنێکی لوتکەیی. تا کارەکەت گرنگتر بێت، زۆر گرنگتر و پێویستە بۆ تۆ کە کاتەکانت ڕێکبخەیت تاوەکو لەسەر پرۆژەیەکی ڕشت و جددی کار بکەیت.

بەلایەنی کەمەوە پێویستت بە شەست بۆ نەوەد خولەك هەیە بۆ بەئەنجام گەیاندنی هەر کارێکی پێویست و بەسوود. نزیکەی سی خولەکی دەوێت تاوەکو هزرت بۆ ئەرکێکی ئاڵۆز ئامادە بکەیت، وەك ئامادەکردنی پێشنیارەکان، ڕاپۆرتەکان وە تەنانەت بەرنامەداڕێژان بۆ پرۆژەیەکی گرنگ. هەر کە دەستت کرد بە ئەرکەکە، لە پاشان دەتوانیت زۆر بە وریایی و بە داهێنەرانە بۆ ماوەی شەست خولەکی دیکە بە تاکە کەسی بیربکەیتەوە وە یاخود نەوەد خولەك بۆ ئەو کارانەی گرنگتر و چارەنووسسازترن.

### داهێنان و بەڕێوەبردن تێکەڵ مەکە

ناتوانیت ئەرکە داهێنەرەکان لەگەڵ ئەرك و فرمانەکانی بەڕێوەبردندا تێکەڵ بکەیت، لە ڕاستیدا

ناتوانیت ئەرکێکی تایبەتی و ئەرکی داهێنەرانە ئەنجام بدەیت لە هەمان کاتدا پێویستی بە هەردوکیان نییە. کارو چالاکییەکانی نوسینگە پێویستی بە بیرکردنەوەی خێراو کورتخایەن هەیە، بەلام ئەرکە داهێنەرەکان پێویستی بە بیرکردنەوەو بەرنامە بۆداڕێژان و کۆشش هەیە.

وەك "کاتی سەرەکی ناوەکیت" بیر لە کاتە داهێنەرەکان بکەرەوە، وە هەروەها وەك "کاتی سەرەکی دەرەکیت" بیر لە کاتە تایبەتەکانت بکەرەوەو تێکەڵاویان مەکە. هەگیز ناتوانیت کارێکی مەزن و داهێنەرانە کە پێویستی بە بیرکردنەوەی چڕوپڕ هەیە لە ژینگەی نوسینگەیەکی ئاساییدا بکەیت مەگەر لەسەر دەرگاکەت بنووسیت "تکایە بێزارم مەکە".

ئەگەر نا، دەبێت داهێنەر بیت لە دۆزینەوەی ڕێگاکان بۆ ئەوەی دوور بکەویتەوە لە ژینگەی کارەکەت و بەم هۆیەوە بتوانیت ئەو ئەرکانەی کە کارەکەت پشتی پێدەبەستیت بە ئەنجام بگەیەنیت.

## چۆن کاتی زیاتر بە دەست بهێنیت؟

لێرەدا چەندین ڕێگا دەخەینە ڕوو بۆ دروستکردن و بەدەستهێنانی کات، کە هەریەکێك لەمانە دەکرێت پەرە بە کاریگەری و کارامەیت بدات.

یەکەم، لە بەرەبەیانیاندا کار بکە ئەو دەمەی کە تەوار مێشکت ساف و بەئاگایە، زۆرێک لە خەڵکی داهێنەر لە کارو بازرگانیدا خۆیان وا ڕادەهێنن کە زوو بچنە ناو جێگەی نووستن و هەر زووش لە خەو هەڵبستن نزیک کاتژمێر پێنج یاخود شەشی بەیانی. هەر بەم هۆیەوە دەتوانن بۆ ماوەی شەست بۆ نەوەد خولەك بە بەردەوامی و بێ پچڕان کار بکەن بەرلەوەی بچنە سەر کار لە نوسینگەکانیان. تەنانەت ئەگەر کەمێك درەنگتریش بچین بۆ نوسینگەکەت، لەو نەوەد خولەکەی کاری بەردەوامیدا دەتوانیت ئەوەندە بەئەنجام بگەیەنیت کە کەسێکی ئاسایی لە ماوەی سێ سەعاتدا لە ژینگەی نوسینگەکەیدا بە ئەنجامی دەگەیەنیت.

کاتێکی دیکە کە دەتوانیت لە سودی خۆتی بەکاربهێنیت کاتی نانخواردنە (نانی نیوەڕۆ)، ئەمە دەرفەتێکی مەزنە تاوەکو مۆبایلەکەت و هێڵی ئینتەرنێت بکوژێنیتەوەو هەموو ئەو هۆکارانەی هزرت پەرتەوازە دەکەن لاببەیت لە کاتێکدا هەموو ئەوانی دیکە لە دەرەوەی نوسینگەکەن و سەرقاڵی نانخواردنن، لەم کاتەدا شەست خولەکی تەواو بێدەنگت هەیە کە دەتوانیت بە وردی و درشتی و بە مێشکێکی سافەوە بیر لە زۆربەی ئەرکە گرنگەکانت بکەیتەوە.

## تکایە بێزارم مەکە

یەکێکی دیکە لە شێوازەکان کە دەتوانین بەکاری بهێنیت بریتییە لە داخستنی دەرگای ئۆفیسەکەت و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کە هەموو ڕۆژێک بتوانیت بە شێوەیەکی ورد کار لەسەر گەورەترین ئەرکت بکەیت.

زۆرێک لە جێبەجێکارەکان هێماو نوسراوی "تکایە بێزارم مەکە" لەسەر دەرگای ئۆفیسەکەیان هەڵدەواسن. هەمووان ئەوە دەزانن کاتێک ئەم هێمایە بەسەر دەرگاکەوە بێت هیچ کەس ڕێگە پێنەدراوە بۆ ئەوەی بچیتە ژوورەوە مەگەر بۆ کاتی کارێکی کتوپڕ و لەناکاو بێت.

چاودێرەکەم (سکرتێرەکەم) کە ژنێکی بەهرەمەند و کارامەیە، هەمیشە گلەیی ئەوەم لێدەکات کە زۆر کاری پێدەبڕدرێت لەلایەن خەڵکی جیاوازەوە. هەر بەم هۆیەوە، ناتوانێت درێژەی کارە ژمێریارییەکانی بەدەست بگات و ڕاپۆرت و ڕوونکردنەوە داراییەکان بنێرێتەوە بەپێی خشتەی کارەکەی خۆی. لە دوای ئەوە پێشنیارم بۆی کرد کە نوسراوی "تکایە بێزارم مەکە" هەڵبواسیت بە دەرگای ژوورەکەیەوە و بەبێ وەستان لە بەیانیان و ئێوارانـدا بۆ سەعاتێک و بەبێ وەستێنەرە دەرەکییەکان کار بکات، ئەوە ڕێڕەوی کارەکەی دەگۆڕێت. دوای ماوەیەک پێی وتمەوە کە بە چەند ڕۆژێکی کەم هەموو ئەرکەکانی بەئەنجام گەیشتوون. لەوەش زیاتر، هیچ یەکێك لەو نابڕو

وەستێنەرانە وادەرکەوتن کە ئەوەندە گرنگ نەبوون نەتوانن چاوەڕێ بکەن بۆ کاتێکی دیکە.

## چەند کاتژمێرێکی زیادە بەدەست بهێنە

یەکێکی دیکە لە تەکنیك و ڕێگا گەورەکان کە لە ڕاستیدا زۆرینەی جێبەجێکارەکان بەکاریدەهێنن، زۆر سادەیە بەڵام دەبێت بە شێوازێکی یاسایی و ڕێگەپێدراو بێت. ئەویش ئەوەیە کە زووتر لەخەو هەڵبسیت و بچیتە نوسینگەکەت کاتژمێرێك زووتر و لەپێش ئەوانی دیکەوە. ئەو کاتژمێرە بەکاربهێنە بۆ ڕێکخستنی ڕۆژەکەت و دەستبەکاربوون بەر لەوەی هەر ئەگەر و وەستێنەرێکی شیاو بێتە پێش. پاشانیش لە کاتی نانخواردن و پشووی نیوەڕۆدا و بەدەستهێنانی کاتژمێرێکی دیکە زیاتر لە داهێنان لە کۆتاییشدا، کاتژمێرێك زیاتر بمێنەوەو لە دوای ئەوەی هەمووان ڕۆشتنەوە بۆماڵەوەو ئەو کاتەش بۆ پێچانەوەو ڕێکخستنەوەی کارەکانی ئەو ڕۆژەت و تەواوکردنی گرنگترین ئەرکت بەکاربهێنە.

ئەمە ڕێگەو شێوازێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە! بە ڕێکخستنی ڕۆژەکەت بەم شێوەیە لە قەرەباڵغی جادەوبان و ترافیك لایت ڕزگارت دەبێت لە هەردوو کاتی چوون بۆ سەر کارو گەڕانەوەشت بۆ ماڵەوە.

لەم نێوەندەشدا، سێ کاتژمێری کارکردن بەدەست دەهێنیت هەموو ڕۆژێک. زیارد لە دوو ئەوەندە و سێ ئەوەندە و تەنانەت پێنج ئەوەندە بە دەست دەهێنیت کە کەسێکی ئاسایی لە ماوەی کاری ڕۆژانەیدا بەدەستی دەهێنێت. بە بەکارهێنانی ئەم ڕێگە شێوازە دەتوانیت دەستکەوت و بەرهەمهێنانت دوو هێندە بکەیت و ڕێژەوی کارەکانت بگۆڕیت.

لەبیرت بێت، کە تۆ بلیمەتێکی شاراوەیت. یەکێك لەو بوارانەی کە دەتوانیت تواناکانی داهێنانی خۆت تێدا بسەلمێنی ئەوەیە کە کاتەکانت ڕێکخەیت لە کاتێکدا کە دەتوانیت زیاتر ئەنجام بدەیت و دەست بە جوڵەو بەرەوپێشچوونی خێراتر بکەیت لە کاروبارەکانتدا.

# بەشی پازدەیەم
## کۆنترۆڵی ناوبڕ و وەستێنەرەکان بکە

ناوبڕو وەستێنەرە بەرنامە بۆ دانەڕێژراو و چاوەڕوان نەکراوەکان زۆرینەی کات لە گەورەترین بەفیڕۆدەرەکانی کاتن لە بازرگانی و پیشەسازیدا. ئەم وەستێنەرانە دەکرێت لەسەر شێوەی هاتنی زەنگێك بێت لە کۆمپیوتەرەکەتەوە یاخود زەنگی تەلەفۆنەکەت و هاتنی نامەیەك بێت بۆ مۆبایلە زیرەکەکەت، یاخود دەنگی پێی کەسێك بێت کە دێتە ناو ئۆفیسەکەت (بۆ ئەوەی قسەت لەگەڵ بکات) یان (لەبەرئەوەی پێویستیان بە قسەکردن و گفتوگۆ هەیە).

دەرکەوتووە کە خەڵکی گەورەترین وەستێنەرو کات بەفیڕۆدەرن لە جیهانی کارکردندا. لە سەدا پەنجای کاتی کارکردن بەسەردەبرێت لە بێئیشی و دەمەتەقێ کردن لەگەڵ هاوپیشەکانیاندا. زۆرێك لە خەڵکی لە بەیانیاندا دێنە سەر کارەکانیان و دەستدەکەن بە قسەکردن لەگەڵ هاوپیشەکانیاندا، وە پاشانیش بۆ ماوەی دوو بۆ سێ کاتژمێری دیکەش بەردەوام دەبن. لە زۆرینەی شوێنەکاندا، خەڵکی دەست ناکەن بە ئیشی جدی هەتاوەکو نزیکی کاتژمێر یازدە، وە پاشانیش هەر زوو کاتی نانی نیوەڕۆت دێت لە دوای نانخواردن، دەگەڕێنەوە و دەستدەکەنەوە بە

قسەکردن وە ناگەڕێنەوە بۆ سەر کار هەتاوەکو کاتژمێر یەك و نیو یاخود دووی دوانیوەڕۆ.

## هەموو کاتی کارکردنەکەت، کار بکە

یاساکە بۆ تۆ ئەوەیە کە "کاربکەیت، هەموو ئەو کاتەی لەسەر کاریت". هەر کە دەگەیتە شوێنی کارەکەت دەستبەجێ دەست بەکارکردن بکە، دەست مەکە بە قسەکردن لەگەڵ ئەوانی دیکە، خوێندنەوەی ڕۆژنامە وە یاخود گەڕان بەناو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا. هەروەك ئێوارەی ڕۆژی پێشتر بەرنامەت بۆ ڕۆژەکەت داناوە، دەستبەجێ دەستبەکار بە لە سەر گرنگترین ئەرکت، وە بەردەوامبە لە کارکردن، ئەرك دوای ئەرك، هەتاوەکو هەموو کارە گرنگەکانت بەئەنجام دەگەیەنیت.

## کەمکردنەوەی وەستێنەرەکان

کاتێك کەسێك پەیوەندیت پێوە دەکات، خێرا کۆتایی پێبهێنە، شتێکی وەك ئەمە بڵێ "سڵاو بێڵ زۆر دڵخۆشم بەوەی گوێم لە دەنگت بوو، دەتوانم چیت بۆ بکەم؟"

یەکسەر بچۆرە سەر بابەتەکە، کات بەفیڕۆ مەدە، پێش ئەوەی تەلەفۆنەکە بکەیت، بە خێرایی هەموو ئەو خاڵانە بنوسە کە دەتەوێت لە پەیوەندییە تەلەفۆنیەکەتدا بیگەیەنیت. کاتێك کەسەکە دێتە سەر هێڵ بڵێ "دەزانم چەندە سەرقاڵیت، تەنها سێ خاڵ هەیە کە پێویستە

لەگەڵت باسی بکەم وە پاش ئەوە ڕێگەت دەدەم بگەڕێیتەوە سەر کارەکەت".

ئەم ڕێگایە هەم پڕ ڕەوشت و هەم پیشەگەرییشە. زۆرێك لە کاربەدەستە سەرقاڵەکان زۆر سوپاسگوزار دەبن ئەگەر خێرا بچنە سەر ناوەڕۆکی بابەتەکەو خێرا کۆتایی بە پەیوەندییەکە بهێنیت. کاتێك کەسێك دێت بۆ نوسینگەکەت تاوەکو قسەت لەگەڵ بکات، دەتوانیت بڵێیت "زۆر حەزدەکەم ئێستا قسەت لەگەڵ بکەم، بەڵام لە ڕاستیدا پێویستە بگەڕێمەوە سەر کارەکەم، دەبێت بۆ ئەم ئێوارە ئەم ئەرکە تەواو بکەم".

هەرکاتێك ئەم وشە جادووییانەت وت "پێویستە بگەڕێمەوە سەر کارەکەم" کەسی بەرامبەر هەر خێرا هەڵدەسێت و دەڕوات.

**بەخێرایی هەستەوە سەر پێ**

بۆ کەمکردنەوەی کاتی وەستێنەرە چاوەڕەواننەکراوەکان کاتێك کەسێك دێتە نوسینگەکەت، هەستە سەرپێ و لێی نزیك ببەرەوەو پێی بڵێ "هەر ئێستا لە ڕێگەدا بووم بۆ ئەوەی بچمە دەرەوە دەتوانم چیت بۆ بکەم؟".

لە پاشان، لەگەڵ ئەو کەسە لە دەرەوەی نوسینگەکەت و بەناو ڕاڕەوەکاندا پیاسە بکە و، قسەی لەگەڵ بکەو گوێی بۆ بگرە کاتێك لە قسەکردن تەواو بوو، لە پاش ئەوە لێی

بگەڕێ بڕواتەوە سەر ئیشەکەی خۆی و تۆش بگەڕێرەوە بۆ سەر کارەکەی خۆت لە نوسینگەکەت.

ڕێگە شێوازێکی دیکە ئەوەیە کە میوانەکانت ببەیتە شوێنی چاوپێکەوتن و بەخێرهاتنەکان نەک بیانهێنیتە شوێنی کارەکەت لە نوسینگەکەی خۆتدا.

لە پاشاندا، بەڕێزەوە کاتێکی دیاریکراو بۆ گفتوگۆکردن دانبێ بە وتنی هەندێك شت وەك "پەیوەندییەکی تەلەفۆنی زۆر گرنگم هەیە لەگەڵ یەکێك لە بریکارەکانمان لە لەندەنەوە ڕێك لە کاتژمێر سێ و پانزە خولەکداو ناتوانم لەو پەیوەندییە دوابکەوم دڵنیام دەتوانین هەموو ئەو شتانە بخەینەڕوو کە پێویستە بەر لەو کاتە".

پیتەر درەککەر لە پەرتوکی "جێبەجێکارە کاریگەرەکاندا" ئەو خاڵە دەخاتە بەرچاو کە تەنها خەڵکانی دیکە کاتی تۆ بەفیڕۆ نادەن بەڵکو تۆش کاتی ئەوانی دیکە بەفیڕۆ دەدەیت، پێشنیاری ئەوە دەکات کە بوێری ئەوەت هەبێت بڕۆیت و پرسیار لە ئەوانی دیکە بکەیت و بڵێیت "چ کارێکم کردووە کە بووبێتە هۆی بەفیڕۆدانی کاتی تۆ؟" کاتێك بانگەشە دەکەیت بۆ ئەوەی کەسانی دیکە لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا بە تەواوی ڕاستگۆبن لەگەڵت، ئەوا زۆر سەرسام دەبیت بەو بیرۆکانەی گوێت لێدەبێت و دەبێتە هۆی زیادبوونی کارایی و کاریگەریی تۆش و ئەوانیش.

# بەشی شازدەیەم
# دەستەو تاقم کردنی ئەرکەکانت

بە سادەیی دەستەکردنی ئەرکەکانت واتە ئەنجامدانی ئەرك و شتە هاوشێوەکان لە یەك کاتدا. چەماوەیەکی فێربوون هەیە لە هەموو ئەو شتانەی ئەنجامیان دەدەیت. کاتێك زنجیرەیەك لە ئەرکە هاوشێوەکان یاخود ئەرکە چونیەکەکان لە ڕیزێکدا بە ئەنجام دەگەیەنین، ئەوا چەماوەی فێربوون ڕێگە دەدات بە کەمکردنەوەی ئەو کاتەی کە پێویستە بۆ تەواوکردنی ئەرکێك بە ڕێژەی لەسەدا هەشتا بە بەراورد بە تەواوکردنی پێنج لە ئەرکە چونیەکەکان.

بۆ نموونە، لە نوسینی نامەو وەڵامدانەوەی ئیمەیڵەکان، هەموویان پێکەوە دەستە دەکەیت و لە یەك کاتدا وەڵامیان دەدەیتەوە.

هەموو پەیوەندییە تەلەفۆنیەکانت دەستە دەکەیت لە یەك ڕیزداو پاشان دەگەڕێیتەوە سەریان. ئەگەر پێویست بوو کە چاوپێکەوتن لەگەڵ چەند کەسێکدا بکەیت ئەوا بەدوای یەکداو یەك لەدوای یەك چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بکە. هەموو ئەرکە هاوشێوەکانت لە هەمان کاتدا ئەنجام

بدە، نەك ئێستا کەمێك وە پاشان کەمێکی دیکەی لێ ئەنجام بدەیت.

## ئیمەیلەکانت وەك خزمەتکارێك بەکاربهێنە

چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ ئیمەیلەکانتـدا بکـەیت ئـەوا بـە هەمان شێوە کاریگـەری سەرەکی دەبێت لەسـەر کارەکـەت. زۆرێـك خـەڵك هـەن بوونەتـە کۆیلـەی نامـەو ئیمەیڵـەکانیان. زەنگێکیـان دانـاوە بـۆ ئاگـاداربوون لـە هـاتنی هـەر نامـەو ئیمەیڵێکی نوێ، وە هەرچیەکیش بکەن خێرا دێن و نامەکە دەکەنـەوە و وەڵامـی دەدەنـەوە، ئەمـەش کاریگـەری دەبێـت لەسەر "ئەرکەکانیان" لە ئەرکەکانیان دادەبڕێن و لە پاشان دەگەڕێنەوە سەری. هەر بەهۆی ئەمەشـەوە زۆر بە خێرایـی، وزەو ڕوونی و بەرهەمی گرنگترین ئەرکیان لەدەست دەدەن.

تـیم فێـریس لـە پڕفرۆشـترین پەرتوکیـدا ئـەوە ڕوون دەکاتەوە چۆن توانیویەتی خۆی ڕزگار بکات لە بوونی بە کۆیلەی ئیمەیڵەکانی کە ڕۆژانـە دوازدە بۆ چواردە کاتژمێر بەردەوام خەریکی وەڵامدانەوەی ئیمەیڵەکانی بووە.

سـەرەتا، بڕیاریـدا کـە ڕۆژانـە تـەنها دووجـار وەڵامـی نامـەکان بداتـەوە لـە کاتـژمێر یـازدەی بـەیانی و چـواری ئێـوارەدا. پاشـان ئـەو دووجارەشـی کـرد بـە یـەك جـار لـە ڕۆژێکدا و پاشانیش یەك جار لە هەفتەیەکدا. تەنانەت لە کـاتی وەڵامدانـەوەی هەفتانـەی نامەکانیـدا کارامـەیی و کاریگەری و داهێنان و داهاتی ڕووی لەزیادبوون کرد.

جولی مۆرجێنستێرن، شارەزای بواری کات ڕێکخستن، کتێبێکـی نوسـیووە بـەناوی "هــەرگیز سـەیری نامـەر ئیمەیلەکانت مەکە لە بەیانیانـدا" ئەم ناونیشـان و بیرۆکەیە وەك شۆکێك وابوو بۆ زۆرێك لە خەڵکی.

## دەتوانن چاوەڕێ بکەن

زۆرێك لەو کەسە داهێنەرانەی کە دەیانناسم وەڵامێکی دەسـتبەجێ و ئۆتۆماتیکیـان هەیـە بـۆ ئیمەیڵـەکانیان. شتێکی وەك ئەمە دەخوێنێتەوە: "من ڕۆژانە تـەنها دووجار ئیمەڵەکانم دەخوێنمەوە، ئەگەر نامەت ناردووە، ئـەوا بەپێی پێویست وەڵامت دەدەمەوە، وە ئەگـەر حاڵـەتی لـەناکاو بوو ئـەوا پەیوەنـدی بـەم ژمـارەوە بکـەو قسـە لەگـەڵ ئـەم کەسە بکە".

ڕۆژنامەنووسێك باس لـە چیرۆکی ڕۆشتنی دەکات بۆ ئـەوروپا بـۆ مـاوەی دوو هەفتـە. ئیمەیڵەکـەی داخرابـوو بـە درێـژایی کاتەکە. کاتێك کـە گەڕابوویـەوە، زیـاتر لـە حـەوت سـەد نامـەی بـۆ هـاتبوو کـە چـاوەڕێی وەڵامـی ئـەم بـوون. دەیزانـی کـە چـەندین کاتـژمێر وە یـان لانـی کـەم چـەندین ڕۆژیان دەوێت هـەتاوەکو هـەموو نامـەکان بخوێنێتـەوە، هەر لەبەر ئەمە هەناسەیەکی قـوڵی هەڵمژی و هـەموو نامـەکانی "سڕییەوە".

ئەمــە هەڵســوکەوتێکی زۆر ســادەبوو، وتــی: "ئـەوە ڕەتدەکەمـەوە کـە ببمـە کۆیلـەی هـەر کەسـێك کـە نامـەم بۆ

دەنێرێـت، وە چـاوەڕوانی دەکـات وەڵامـی بدەمـەوە بـە خێرایـی، لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئەگـەر هـیچ یـەکێك لـەو نامانـە گرنگ بوونایـە، ئـەو کەسـەی کـە ناردوویـەتی ئـەوا دووبارە دەینێرێتەوە".

ڕاسـتی کـرد لـە سـەدا نـەوەدی ئـەو نامانـەی کـە بـۆی هـاتبوو هـەرگیز دووبـارە نەنێردرانـەوە، وە ئەوانەشـی کـە سڕابوونەوەو گرنگ بوون لـە چەند ڕۆژێکی کەمدا دووبارە ناردیانەوە.

بڕیاربـدە کـە ڕێگـا نـەدەیت ئیمەیڵـەکانت کـۆنترۆڵی ژیانت بکەن، هەروەك کلکی سـەگێگ بتلەقێنن، لەبری ئەوە خـۆت ڕابهێنـە کـە ئیمەیڵـەکانت وەك ئـامرازێکی بازرگـانی بەکاربهێنیت.

وەڵامەکانت با خێراو پوخت بن، ڕۆژانە تـەنها دووجار یاخود کـەمتر سـەیری نامـەکان بکـە. تەنانـەت وا باشترە واز لـە ئیمەیڵـەکانت بهێنیـت بـۆ کۆتـایی هەفتـە و کـاتی زیـار لەگـەڵ خێزانەکـەت و هاوڕێکانـت بەسـەر ببـەیت یـاخود سەرقاڵی چەلاکییە کەسییەکانت بیت.

هـەرگیز هـیچ نامەیـەکی گـرنگ لەدەسـت نـەدەیت. شتانێکی زۆر کـەم هـەن کـە ڕوودەدەن و نـەتوانن بـۆ مـاوەی یـەك، دوو ڕۆژی دیکـە چـاوەڕێ بکـەن، بەتایبـەتی لـە بازرگانیدا.

# بەشی حەڤدەهەم
# پەیوەندییە تەلەفۆنیەکانت ڕێک بخە

تەلەفۆن دەکرێت خزمەتکارو یاریدەدەرێکی باش بێت وە یاخود ببێتە گەورە و سەردارێکی سامناک بەتایبەتی لە کاتێکدا کەوا هەستبکەیت ناچاریت وەڵامی بدەیتەوە هەر کاتێـک زەنگـی لێـدا. بـۆ دەسـتکەوتن و بەدەسـتهێنانی گەورەترین داهێنان، دەبێت تەلەفۆنەکەت لە شوێنی خۆی دابنێیت تاوەکو لە کۆتاییدا نەتکاتە کۆیلەی هەر کەسێک کە ژمارەی تۆی لەلایە.

باشـترین ڕێگـا بـۆ کـۆنترۆڵکردنی پەیوەندییـەکانت ئەوەیە کە لەلایەن یاریدەدەری بەڕێوەبردنەکەتەوە وەڵامی پەیوەندییـەکان بدرێتـەوە و مۆبایلەکـەت بێـدەنگ بکـەو لێگەڕێ چەند پەیوەندییەکی کەم هەن کە ناتوانن چاوەڕێ بکەن تاوەکو تۆ کاتی گونجاوت دەبێت بۆ ئەوەی وەڵامیان بدەیتەوە.

یـەکێك لـەو هۆکارانـەی کـە دەمانکاتـە کۆیلـەی سەرقاڵییەکان ئەوەیە کە حەز بە زانینی شتەکان دەکەین، ناتوانین خۆمان بوەستێنین لەوەی کە ئایا ئەوە کێیە نامەی بۆمان ناردووە، یاخود کێ لەسەر هێڵی تەلەفۆنە. تاکە ڕێگا بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم فریودانەی کە سەرقاڵمان دەکات

ئەوەیە کە مۆبایلەکەت بکوژێنیتەوە بە تەواوی هەر بەم مۆیەوە تەنانەت گوێشمان لە زەنگی مۆبایلەکە نەبێت.

هەر کاتێک چاوپێکەوتنێکت دەبێت لەگەڵ دەستەی کار و جێبەجێکاردا وە یاخود لەگەڵ سەرۆک کارو کڕیارەکاندا، ئەوا مۆبایلەکەت وەلابنێ و بیکوژێنەرەوە. ڕێگا بە هیچ ناوبڕو وەستێنەرێك مەدە، بە دەگمەن شتی زۆر گرنگ هەن کە نەتوانن چاوەڕێ بکەن.

گفتوگۆیەکی دە خولەکی لەگەڵ کەسێك بەبێ وەستان و وەستێنەرەکان دەکرێت زۆر کاریگەر و داهێنەرانەتر بێت لە گفتوگۆیەکی سی یاخود چل خولەکی و وەڵامدانەوەی تەلەفۆن لەمیانەی گفتوگۆیەکەدا. دواتر دەتوانیت پەیوەندی بەو کەسانەوە بکەیتەوە یەك لە دوای یەك.

## پەیوەندییەکانت گوزمر بکە

ئەگەر پێویست بوو زنجیرەیەك لە پەیوەندی تەلەفۆنی بکەیت لە ماوەی ڕۆژەکەتدا، ئەوا هەموویان لە هەمان کاتدا ئەنجام بدە. کاتێك تەرخان بکە کە بتوانیت هەموو سەرقاڵیەکانی دیکەت وەلابنێ و تەنها پەیوەندی بەو کەسە گرنگانەوە بکەیت کە لە لیستەکەدان. ناو و ژمارەو بابەتی پەیوەندییەکەت بنوسە لەسەر کاغەزێك. بە شێوەیەك خشتەی پەیوەندییەکانت دابنێ وەك ئەوەی خشتەی چاوپێکەوتن بێت لەگەڵ سەرۆك کارەکەت. ئەگەر پەیوەندییەکی گرنگ بێت ئەوا بابەتی پەیوەندییەکە بنوسە

کە دەتەوێت گفتوگۆی لەسەر بکەیت و بتوانیت بەپێی لیستەکەت بڕۆیت. هەندێك جار چەند شتێکی کەم هەن کە تووڕەت دەکەن لەوەی بتوانیت پەیوەندی بە کەسی بەرامبەرەوە بکەیت و پەیوەندییەکەت بۆ وەرناگرێت و ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کە خاڵێکی گرنگت لە بیرکردووە لەبەرئەوەی پێشتر نەتنوسییوە لە لیستەکەدا.

## بەڕێز و پیشەگەربە

کاتێك پەیوەندی بە کەسێکەوە دەکەیت هەمیشە لێی بپرسە "ئایا ئەمە کاتێکی گونجاوە بۆ قسەکردن؟"

زۆرینەی جێبەجێکارە سەرکەوتووەکان ئەم دەستەواژە پڕ ڕێز و پیشەگەرییە بەکاردەهێنن بۆ دەستکردن بە گفتوگۆکردنی پەیوەندییە کات بۆ تەرخان نەکراو و لەناکاوەکانیش. ئەگەر بارێکی کتوپڕ ڕوویدا لەو کاتەدا، ئەوە ڕەنگە کاتێك باش نەبێت بۆ گفتوگۆ. ئەگەر هەوڵبدەیت لەو خاڵەدا بەردەوامی بدەیت بە گفتوگۆکردنەکە، ئەوا ڕەنگە کەسی بەرامبەرت نەتوانێت بە باشی گوێت بۆ بگرێت و ئاگاداری قسەکانت بێت هەر لەبەر ئەمە هەمیشە بپرسە: "ئایا ئەمە کاتێکی گونجاوە؟".

ئەگەر کەسەکەی دیکە وتی کە ئەمە کاتێکی باش و گونجاو نییە، ئەوا بڵێ کە دواتر پەیوەندی دەکەمەوە یاخود چ کاتێك گونجاو بوو ئەوا پەیوەندیم پێوە بکەرەوە.

ئەمە ڕێگەیەکی سادەیە بۆ پشاندانی ڕێز و پڕ بایەخ دەنرخێنرێت هەرگیز وا دایمەنێ کە کەسی بەرامبەرت کاتی هەیە بۆ قسەکردن لەو کاتەدا، کێشە نییە کە پێشتر چیت ڕێکخستووە.

## لە پەیوەندییە زیادەکان بەدووربە

هەموو ئەگەر شیاوەکان جێبەجێ بکە بۆ ئەوەی لەپەیوەندی زیادە بەدوور بیت. خشتەی پەیوەندییەکانت بە شێوەیەك ڕێکبخە وەك ئەوەی چاوپێکەوتنێکی ڕووبەڕووت هەبێت لە نوسینگەکەتدا، کاتێك پەیوەندی بە کەسێکەوە دەکەیت، کات و ژمارەی تایبەت بەجێبهێڵە کە بەردەست بێت. وە کاتێك خەڵکی پەیوەندیت پێوەدەکەن و تۆش هەمیشە ناتوانیت قسەیان لەگەڵدا بکەیت، ئەوا کاتێکی تایبەت تەرخان بکە تاوەکو بتوانیت پەیوەندی بکەیتەوە بەو کەسانەوە، وە ڕەنگە لەو کاتانەدا بێت کە لە نوسینگەکەتیت و تەلەفۆنەکەت لە تەنیشتەوە بێت ئەوا دەتوانیت لە کاتی خۆیدا پەیوەندییان پێوە بکەیت.

پەیوەندییەکانت وەك ئامرازێکی بازرگانی بەکاربهێنە. بە خێرایی پەیوەندییەکانت ئەنجام بدەو بابەتەکان بخەرە ڕوو وە کۆتایی بهێنە بە پەیوەندییەکەت. بە ڕێز و دۆستانەو کارزان و لێهاتووبە.

هـەتا زیـاتر سـنوردار و ئامادەبیـت سـەبارەت بـە پەیوەندییـەکانت و گفتوگۆکردنـەکانت، ئـەوا خێراتـر دەگەیتـە کۆتـایی و زیـاتر بـە بەرهـەم دەبیـت لـە هـەموو پەیوەندییەکانتدا.

## ئەنجامدانی کۆبوونەوەی کاریگەرانە

بـە تـەواوی و بـە ڕێـژەی لەسـەدا بیسـت و پێـنج بـۆ لەسەدا پەنجای کاتی بەڕێوەبردن لە کۆبوونەوەکاندا بەسەر دەبرێـت لـە هـەموو جۆرەکـانی. ڕەنگـە کۆبوونـەوەی یـەك بە یەك بێت، یاخود بینینێکی کورتخایەن بێت لە ڕاڕەوەکانداو یاخود لە کاتی چوون و دەرچوون بێت لە نوسینگەکەت، وە یـاخود چـاوپێکەوتنێکی فـەرمی بێـت و لـە نوسـینگەکەت یاخود لـە ژووری کۆبوونـەوە ئـەنجام بـدرێت. بەداخـەوە، کە لەسـەدا پـەنجای زیـاتری کـاتی کۆبوونـەوەکان بـەفیڕۆ دەدرێـن. کۆبوونـەوەکان کـاتێکی زۆریـان پێویسـتە و نرخ و بەهایەکی کەمیشیان هەیە. هەرچۆنێك بێـت، کۆبوونـەوەکان کلیلی بەڕێوەبردنن و پێویستە کاریگەرانە بەکاربهێنرێن.

## بەهای کۆبوونەوەکانت هەژمار بکە

دڵنیابـەرەوە لـەوەی کـە هۆکـارێکی باشـت هـەبێت بۆ پەیوەندییـەکانت و ئەنجامـدانی هـەر کۆبوونەوەیـەك وەك وەبـەرهێنانێکی بازرگـانی لـە هـەموو کۆبوونـەوەیـەك بڕوانە.

ڕێـژەی کرێـی کاتـژمێری ئـەو کەسـانە کۆبکـەرەوە کـە لـە کۆبوونەوەکـەدان و ئـەوەش بزانەکـە پێویسـتە ئـەو ڕێـژە پارەیە لە وەبەرهێنانەکانی خۆت بگێڕیتەوە بۆیان.

ئەگەر دە کەسـت هـەن لـە ژوورێکدا کە هەریەکەیان لە کاتژمێرێکـدا ٥٠ دۆلاریـان هەیـە، ئـەوا لـە پاشـاندا نرخـی دەبێتـە ٥٠٠ دۆلار لەسـەر حسابی بانکی کۆمپانیاکـەت بـۆ کۆبوونەوەیـەکی یـەك کاتـژمێری. ئەگـەر کەسـێك بیـەوێت ٥٠٠ دۆلار خـەرج بکـات لـە پرۆژەیەکـدا و دێـت بـۆ لای تـۆ تاوەکو پشتگیری و دانپێدانانی بۆ بکەیت، ئـەوا تۆ ڕەنگـە بتـەوێت بزانیـت کـە کۆمپانیاکـەت لـەم بـڕە تێچـووە چـی دەست دەکەوێت. ڕەنگە پێویست بێت بیری لێبکەیتـەوە بۆ ماوەیەك بەر لەوەی پێشنیارەکەی پەسەند بکەیت. تەنانـەت ڕەنگـە داوای زانیـاری زیـاتر وردەکـاری دیکـەش بکـەیت بەرلـەوەی بـە ئاسـوودەیی خەرجییـەکی بـەم قەبارەیـە قبـوڵ بکەیت. بە هەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ هـەر کۆبوونەوەیەکدا بکە.

دوور بکـەوەرەوە لـە هـەر کۆبوونەوەیـەکی ناپێویسـت. هەمیشـە ئـەوە بپرسـە کـە ئـەم کۆبوونەوەیـە پێویسـتە بـە ئەنجام بگەیـەنرێت. هـەر کاتێك کۆبوونەوەکە گرنگ نـەبوو ئـەوا پێویسـت نییـە کۆبوونـەوە ڕێکبخرێت. ئەگـەر کەسـێ خـۆت پێویسـتیت بـە ڕێکخسـتنی کۆبوونـەوە نـەبوو ئـەوا مەیکە. وە ئەگەر کۆبوونەوەت ئەنجام دا لە خۆت بپرسە کە

کێ پێویستە بۆ ئەم کۆبوونەوەیەو تەنها ئەو کەسانە بانگهێشت بکە. دووربە لە بانگهێشتکردنی ئەو کەسانەی کە پێویست ناکات لەوێ ئامادە بن تەنها لەبەرئەوەی وایان لێبکەیت هەست بە باشی و گرنگیان بکەن.

## خشتەی کارەکانت ئامادەبکە

بۆ هەر کۆبوونەوەیەك خشتەی کار ئامادە بکە، وە هەمیشە خشتەی نوسراو بەکاربهێنە. لەپێشینەیی بۆ بابەتەکانی خشتەکەت دابنێ و سەرەتا بە گرنگترینیان دەستپێبکە. لە کاتێکدا کاتت کەمەو بەرەو تەواوبوون دەچێت. وەك ڕێکخەر و بەڕێوەبەری کۆبوونەوە، کاری تۆ ئەوەیە کە گفتوگۆیەکە لەسەر ڕێڕەوی خۆی بڕوات و جەخت لەسەر هەموو خاڵێك بکەیتەوە بەر لەوەی بچیتە سەر خاڵێکی دیکە. لە کاتی خۆیدا دەست بە کۆبوونەوەکە بکەو لە کاتی خۆیدا کۆتایی پێبهێنە. ئەگەر کەسانێك هەن کە هەمیشە دوادەکەون، ئەوا ڕەنگە وەها باشتر بێت کە لەگەڵ کاتی دەستپێکردنی کۆبوونەوەکەدا دەرگاکە دابخەیت. ڕێگە شێوازێکی دیکە ئەوەیە کە وای دابنێیت ئەوانەی دواکەوتوون هەر نایەن بۆ کۆبوونەوەکەو یەکسەر دەستبەکار بە. هەر کە دەستت بە کۆبوونەوەکە کرد، دڵنیابەرەوە لەوەی کە هیچ ناوبڕو وەستێنەرێکی دەرەکی لەمیانەی کۆبوونەوەکەدا ڕوونەدات.

لە پڕ فرۆشترین پەرتوکیدا بەناوی "ئەوەی لێرە دەستت دەکەوێت، لەوێ دەستت ناکەوێت" مارشال گۆلدسمس دەڵێت کە یەکێك لە گەورەترین هەڵەکانی ڕابەری کردن بریتییە لە خواستی دەستبەسەراگرتنی کۆبوونەوەکان کە لەلایەن سەرۆك کارەکانەوە ڕێکدەخرێن.

لەبەرئەوەی تۆ سەرۆکیت، هەمووان گوێدەگرن کاتێك تۆ قسە دەکەیت. بە درێژایی کاتەکە ئەوانی دیکە فێری ئەوە نابن کە هیچ بڵێن یاخود قسەت پێببڕن، بەڵکو تەنها ئەوەی لێبگەڕێن تۆ هەر بەردەوام بیت لە قسەکردن هەرچەندێك خۆت بتەوێت و لەسەر هەر بابەتێك.

## پرسیاری زیاتر بکە

لە کۆبوونەوەکاندا، ببە بە کونەپەپووە زیرەکە پیرەکە کە دوو گوێچکەت هەبێت لەگەڵ یەك دەمدا، دەم و گوێیەکانت بە تەواوی و گونجاوی بەکاربهێنە. پرسیاری زیاتر بکە و بە وردی گوێبگرە وەك لەوەی کە هەر قسە بکەیت لەسەر بابەتی خشتەکە. کۆبوونەوەکە بۆ پوختەکردنی هەموو بیرۆکە باشەکانی ئامادەبووان بەکاربهێنە، ئەمەیان ڕەنگە گونجاو نەبێت ئەگەر تۆ تەواوی کاتەکە قسە بکەیت.

یەکێك لە کاریگەرترین کۆبوونەوەکان ئەو کۆبوونەوانەن کە بەسەر پێوە ئەنجام دەدرێن، دەتوانیت

ئەم جۆرە کۆبوونەوانە لە نوسینگەکەی خۆشتدا ئەنجام بدەیت، کە هیچ کەسێك دانانیشیت و هەرچیەك پێویست بێت گفتوگۆی لەسەر بکرێت بە خێرایی و بە پوختی گفتوگۆی لەسەر دەکرێت هەمووان دەتوانن بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان زۆر ئاسانە کۆبوونەوەی ئاوا ئەنجام بدرێت.

دەتوانیت بڵێیت "لەبەر کەمی کات وە دەزانم هەمووتان چەندە سەرقاڵن- بەو هۆیەوە با بە پێوە کۆبوونەوەیەکی کورت و پوخت بکەین و بەم جۆرە بتوانین هەموو شتەکان بخەینەڕوو وە بە خێرایی بگەڕێینەوە سەر کارەکانمان". لە کاتێکدا خەڵکەکە هەمیشە سەرقاڵن، ئەوا ئەم جۆرە کۆبوونەوەیە زۆر بەرز دەنرخێنرێت لەلایەن ئەندامان و دەستەی کارگێڕییەوە.

# بەشی نۆزدە

## خێراتر بخوێنەرەوە، زیاترت لەبیربێت

کەسانی پیشەوەر ڕۆژانە سەدان و هەزاران وشەی ئیمەلەکان، ڕاپۆرتەکان، هەواڵەکان، زانیارییە بازرگانییەکان و گۆڤار و ڕۆژنامەکان دەخوێننەوە. بۆ ئەوەی لەمڕۆدا سەرکەوتوو بیت، ئەوا پێویستە بەردەوام لەگەڵ پێویستییەکانی خوێندنەوەتدا بجوڵێیت ئیمە لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوودا دەژین، وە یەك پارچە لە زانیاری دەکرێت کاریگەری هەبێت لەسەر بڕیار و کارەکەت.

هەندێك کات تەرخان بکە تاوەکو ئەو بابەتانە هەڵبژێریت کە دەیانخوێنیتەوە. باشترین پارێزەری کات لە جیهانی خوێندنەوەدا بریتییە لە دوگمەی سڕینەوە لە بەشی خوارەوەی خشتەی کلیلی وشەکاندا. بە بەردەوامی بەکاری بهێنە. وازبهێنە لە بەسەربردنی کات بە خوێندنەوەی ئەو بابەتانەی کە نرخ و بەهای ئەوتۆیان نییە یاخود پەیوەندی بە ژیان و کارەکەتەوە نییە.

**فێری خێرا خوێندنەوە ببە ( خێرا بخوێنەوە )**

ناتوانیت لە هەموو زانیارییە هاتووەکان دووربکەویتەوە بەڵام دەتوانیت لە کات و شوێنی گونجاودا

بەسەریاندا بچیتەوە. یەکێك لە گرنگترین بەهرەکانت ی پێویستە پەرەی پێبدەیت ئەوەیە کە فێر ببیت خێرا بخوێنیتەوە. ئەگەر هەرگیز کۆرسی فێربوونی خێرا خوێندنەوەت نەبینیووە. ئەوا هەر ئێستا پێویستە ئەو کۆرسە ببینی. ئەم تەنها کۆرسە خێرایی خوێندنەوەو ئاستی یادکەوتنەوەت سێ هێندە دەکات، بە تەنها لە دووەم وانەی سەرەتای کۆرسەکەدا. ئەو ئامێرو تەکنەلۆژیایانەی کە پەرەیان پێدراوە لە خێرایی خوێندنەوەدا لە ئێستادا زۆر بەربلاون، وە هەموو کەسێك دەتوانێت فێر ببێت کە چۆن ٥٠٠ بۆ ١٠٠٠ وشە بخوێنێتەوە لە خولەکێکدا بە ئاستێکی بەرزی تێگەیشتنەوە.

## خوێندنەوەکانت دستە بکە

کاتێك بابەتێکی گرنگت بۆ دێتەپێش پوختی بکەرەوە، یاخود پارچە زانیارییەك لە ئینتەرنێت، ئەو چاپی بکە یاخود لەبەر بگرەوە بۆ ناوبڕ بەنگێکی تایبەت لە ناو کۆمپیوتەرەکەتدا تاوەکو کاتێك دیکە بتوانیت بیخوێنیتەوە. لەبری ئەوەی واز لە کارەکەت بهێنیت تاوەکو زانیارییەك بخوێنیتەوە، خوێندنەوەکە دوابخە بۆ کاتێکی دواتر. کاتێك ئەوەت کرد بە خوویەك ئەوا زۆر سەرسام

نەبیت بەو بڕەی کە خوێندووتەوە وە ئەوەی کە چەندە گرنگی دەدەیت بەو ماددەیەی کە دەیخوێنیتەوە.

بەتایبەتی لە بارەی ڕۆژنامەکانەوە، دەتوانیت گرنگترین زانیارییە بڵاوکراوەکانت لەناو کۆمپیوتەرەکەتدا بۆ بێت وە یاخود دەتوانیت ڕۆژنامەکە خۆی بخوێنیتەوە. لە هەردوو باروودۆخەکەدا، بە خێرایی و تەنها ئەو بابەتانە بخوێنەرەوە کە پەیوەندیان بە تۆوە هەیە. لە پەڕەی هەواڵەکاندا، گرنگترین بابەتەکان لە ناونیشانەکان و بڕگەو بەندەکانی سەرەتادایە. زۆربەی کات، پێویست ناکات هەموو وردەکارییەکان بخوێنیتەوە تاوەکو بزانیت و تێبگەیت بە تەواوی چی ڕوویداوە.

### گوڵبژێری خوێندنەوەکانت بکە

گۆڤارو ڕۆژنامەکان بەشێوەیەک نەخشە کێشراون تاوەکو واتلێبکەن هەموو گۆڤارەکە و پەڕە بە پەڕەی بخوێنیتەوە، هەر لەبەر ئەمەشە کە زۆرترین ڕیکلام و ڕاگەیاندنەکان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرێنەوە.

هەر لەبەر ئەوەیە لە خوێندنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامەو دەنگوباسنامەکاندا، پێویستە تەنها ئەو بابەتە هەڵبژێریت بۆ خوێندنەوە کە تایبەت و گرنگن. چاو بخشێنە بە خشتەی بابەتەکاندا و یەکسەر بچۆرە سەر ئەو بابەتەی کە حەزت پێیەو گرنگە بۆ ژیانت و کارەکەت.

تەکنینێکی زۆر باش هەیە بۆ بابەتە نوسراوەکان کە پێی دەوترێت "دڕاندن و خوێندنەوە" ئەو نوسینەی کە دەتەوێت بیخوێنیتەوە بیدڕێنە (لاپەڕەکەی لێبکەرەوە) و بیخەرە ناو بڕبەنگێکەوە کە بتوانیت لەگەڵ خۆتدا هەڵیبگریت و لە کاتێکی دیکەدا بیخوێنیتەوە.

بە وردی چاو بخشێنە بە کتێبەکاندا بەر لەوەی بڕیار بدەیت کە دەتەوێت لەگەڵ کامە کتێبەدا کات بەسەر ببەیت و بیخوێنیتەوە. دەتوانیت بە هەردوو شێوەی چاپکراو و سەرهێڵ بۆ کتێبەکان بگەڕێیت و باشترین بیرۆکە لە هەر کتێبێکەوە وەربگریت لە چەند خولەکێکی کەمدا.

**تەنها بڵێ نەخێر**

باشترین ڕێگا بۆ گێڕاندنەوەی کات لە خوێندنەوەکەتدا ئەوەیە کە بڕیار بدەیت هەموو شتەکە نەخوێنیتەوە، بە سەیرکردنێکی وردی بابەتەکان، لیستی ناوەڕۆکەکان، پێشەکی و زانیاری دەربارەی نوسەرەکە یاخود پێڕستی پەرتووکەکە، بۆت دەردەکەوێت کە ئەم پەرتووکە یاخود نوسراوە گرنگە و بەسودە بۆ تۆ.

لەو دۆخەدا، بوەستە لە خوێندنەوە یاخود بیسڕەوە بە تەواوی هەر بەم هۆیەوە دەتوانیت کاتی زیاتر بەدەست بخەیت بۆ ئەنجامدانی شتی گرنگتر.

**پەرە بە سیستم و بەرنامەیەکی دیاریکراو بدە**

بۆ ماوەی چەندین ساڵ پەرەم دا بە خوودی خوێندنەوە هەموو ڕۆژێک سێ کاتژمێر یاخود زیاتر دەمخوێندەوە لەسەر ئەو بابەتانەی پەیوەندییان هەبوو بە بازرگانی، باری ئابووری، سیاسەت وە پەرەپێدانی کەسییەوە، کە ئەمەش زیاتر بوو لە (١٥٠,٠٠٠) سەد و پەنجا هەزار کاتژمێری خوێندنەوە بە درێژایی کۆرسی کارەکەم. بەو زانیاریانەی کە کۆمکردبۆیەوە، توانیم زیاد لە شەست پەرتوک بنووسم کە ئەمەش یەکێکە لەو پەرتوکانە.

کاتێك خەڵکی لێم دەپرسن کە چۆن دەتوانم ئەوەندە بخوێنمەوە، وەڵامی من زۆر سادە و ڕەوانە. من کارو خوێندنەوەکانم ڕێکدەخەم، خولەك بە خولەك و، کاتژمێر بە کاتژمێر، گەشت بە گەشت وە هەرکاتێك کە بێکار بم وەك ئەو کاتەی لە فڕۆکەخانە چاوەڕێی فڕۆکە دەکەم لە هەموو ئەو کاتانەدا دەخوێنمەوە.

لەبیرت بێت "خوێنەرەکان ڕابەرن" مەحاڵە بتوانیت لە لوتکەی کارو بوارەکەی خۆتدا بمێنیتەوە بەبێ ئەوەی خۆراك بدەیت بە هزرت، بە بەردەوامی بەڵام هەڵبژێرردراوی، ئەو زانیارییانەی کە لەلایەن کەسانی زرنگ و هەمیشە زیندووەوە دادەهێنرێت.

# بەشی بیستەم
# پەرە بە بەرهەمهێنانی کەسی بدە

گرنگترین شتێك کە ئەنجامی دەدەیت بۆ زیادکردنی بەهاو نرخت، پەرەدان بە دەرەنجامەکانت و بوون بە کەسێکی گرنگ بۆ بازرگانییەکەت، ئەوەیە کە باشتر و باشتر ببیت لەو کارە گرنگانەی کە دەیانکەیت.

پەرەپێدانی خودی دەبێت بەشێکی بەردەوامی کاری ڕۆژانەت بێت، ئەمە کلیلی کات ڕێکخستنە کە دەتوانێت بتکاتە جێبەجێکارێکی ئاست بەرز.

کات تەرخان بکە لەگەڵ خشتەی کاتەکانت بۆ ئەوەی بەردەوام بیت لە گەشەکردن و پەرەسەندن. یاسای بنچینەیی بە لەبەرچاوگرتنی پەرەسەندنی کەسیت ئەوەیە کە ناتوانی زیاتر لەوە بڕۆیت و پێش بکەویت کە ئەمڕۆ هەیت و پێی گەیشتوویت بە زانیاری و لێهاتوویەکانت. بۆ ئەوەی زیاتر بڕۆیت و بەرەو پێش بچیت لە کارەکەتدا، ئەوا پێویستە زانیاری زیاتر وەدەست بخەیت. بۆ ئەوەی زیاتر بەدەست بهێنیت دەبێت فێری شتی زیاتر ببیت.

### گەشەکردنی بەردەوام و بێ کۆتایی

ڕۆژانە کار لەسەر پەرەپێدان و بەرەوپێشچوونی خۆت بکە، ئەگەر توانیبێتت ڕۆژانە بۆ ماوەی یەک کاتژمێر بخوێنیتەوە ئەمە پەرە دەدات بە تواناکەت بۆ ئەنجامدانی کارەکەت، ئەمە دەتگەیەنێتە یەکەمینەکانی کۆمەڵگاکەمان لەماوەی پێنج ساڵدا.

گوێ لە بەرنامە دەنگییە پەروەردەییەکان بگرە لەمیانەی ئەو کاتانەی بە ئوتومبێل گەشت دەکەیت. لە ڕاستیدا ئەمڕۆ باشترینی بیرۆکەکان و زانیارییەکان بە زمانی ئینگلیزی و هەموو زمانەکانی دیکەش، بە شێوەی تۆمارکراوی دەنگی بەردەستن لەسەر سی دی یاخود دەتوانیت دایبەزێنیتە ناو مۆبایل و ئامێرە زیرەکەکانت.

هەر ڕێبوارێکی ئاسایی (یاخود کارمەندێکی گواستنەوە) لە هەر ساڵێکدا نزیکەی پێنج سەد بۆ هەزار کاتژمێر بەسەر دەبات لەناو ئۆتۆمبێلدا . ئەمە دوازدە یاخود بیست کاتژمێر دەکاتە هەفتانە، کە ئەمەش یەکسانە بە کۆرسێک یاخود دوو کۆرسی زانکۆ. بەم شێوەیە دەتوانیت سوودمەند بیت وەک ئەوەی بەژدار بیت لە ساڵێکی خوێندنی زانکۆ بە تەنها بە بەکارهێنانی کاتی گەشتەکانت بۆ فێربوون. ئەگەر گوێبیستی بەرنامە دەنگییەکان نەبیت لەناو ئۆتۆمبیلەکەتدا لەمیانەی گەشتەکانتدا، ئەوا یەکێك لە گرنگترین هەلەکانی فێربوونت لەکیس دەچێت.

## بەژداری ئەو کۆڕو کۆبوونەوانە بکە کە لەلایەن شارەزایانەوە دەوترێتەوە

لانی کەم لە ساڵێکدا چوار جار بەژداری ئەو کۆڕانە بکە کە لەلایەن شارەزایانەوە ساز دەکرێت لە بواری پیشەکەی خۆتدا. خوازیاری بەژداری کردنی ئەم جۆرە کۆڕانە بە. ئامادە بە تاوەکو ڕێگایەکی دوور بڕیت بۆ ئەوەی فێر ببیت لەو کەسانەی کە باشترینن لە بازرگانیەکەتدا.

کلیلی سەرکەوتن بۆ تۆیە تاوەکو بەژدار بیت لەو کۆڕو کۆبوونەوانەدا کە لەلایەن شارەزایان و ئەزموونداره‌کانەوە بەڕێوەدەبرێت کە سەرکەوتنیان لە بوارەکەی خۆیاندا بەدەست هێناوە. هەوڵبدە دووربکەویتەوە لەو دەرس و وانانەی کە پرۆفیسۆرەکانی زانکۆ دەیڵێنەوە لە بوارەکانی خۆیاندا. ئەوانەی کە ئەوان فێرمان دەکەن لە ڕووی زانستییەوە ڕاستن بەڵام کردارییانە بێسوودن، هیچ ڕێگەیەکی ئەوتۆ نییە بۆ پەیڕەوکردنی بیرۆکەکانیان تاوەکو بتوانیت دەرەنجامێکی باشتر بەدەست بهێنیت لە کارەکەتدا.

## شوێنی کارەکەت ڕێکوپێک بکە

یەکێك لە ئامڕازە مەزنەکانی ڕێکخستنی کات ئەوەیە کە لەسەر مێزێکی پاك و خاوێن و ڕێکخراو کار بکەیت.

هەروەك چێشتلێنەرێکی باش کە لەپێش و دوای خواردن ئامادەکردن چێشتخانەکەی پاك دەکاتەوە، ئەوا تۆش پێویستە شوێنی کارەکەت ڕێکبخەیت بەرلەوەی دەست بەکارکردن بکەیت. یەکێك لە قۆنتەراتچییە سەرکەوتووەکانی مێژوو دەڵێت کە کلیلی سەرکەوتنی ئەوە بووە کە "هەمیشە لەسەر مێزێکی پاك کاری کردووە".

پیتەر درەککەر تێبینی ئەوەی کردووە کە هەمیشە جێبەجێکارە سەرکەوتوو و کاریگەرەکان مێزێکی خاوێنیان هەیە. هەموو ئەو شتانەی کە لەسەر مێزەکەن وەلای دەنێن جگە لەو شتەی کە کاری لەسەر دەکەن، هەر ئەمەش وا دەکات کە جەخت لەسەر بابەتەکە زیاتر بکەنەوە کاری باشتر بکەن و بە کاتێکی کەمتریش ئەرکێکی زیاتریش بەئەنجام بگەیەنن.

هەموو بەڵگەنامەو قەواڵەکان بە هەردوو شێوەی چاپکراو و سەرهێڵ لەناو بڕبەنگێکی گونجاودا دابنێ تەنها کار لەسەر ئەرکەکەی بەردەستت بکە. هەوڵبدە تەنها یەك بابەتت لەبەردەست بێت.

کەسانی پیشەگەر و ئاستبەرزی هەموو بوارێك بەردەوام شوێنی کارەکانیان بە پاکی و ڕێکوپێکی دەهێڵنەوە. سێربکە، دارتاشەکان، پزیشکەکان یاخود دانسازەکانیش لەدوای خۆیان بە درێژایی ڕۆژەکە شوێنی کارەکانیان پاك دەکەنەوە.

ڕێکخراو بەو بە ڕێکخراوی بمێنەرەوە. دڵنیابە لەوەی ماددەو بابەتەکانی نوسینگەکەت بە تەواوی لەبەردەستان. ڕەنگە ئەوەت بۆ دەربکەوێت کە هیچ شتێك هێندەی وازهێنان لە ئەرکێك و گەڕانەوە سەر هەمان ئەرك بەهۆی نەبوونی پێداویستی تایبەتەوە، وێرانکەری کارایی و کاریگەرییەکانت نییە.

## لە ڕێکخستنەکانت داهێنان زیاد دەکات

زۆرێك لە خەڵکی پێیان وایە کە بەشێوەیەکی باشتر و کاریگەرتر کاردەکەن لە ژینگەیەکی ناڕێکی کاردا و لەسەر مێزێکی هەڕەمەکی. هەرچەندە زۆرینەی لێکۆڵینەوەکان کە لەسەر خەڵکی ئەنجامدراون دەریانخستووە کە لە کاتێکدا ئەو کەسانەی زۆریان لێدەکرێت تاوەکو شوێنی کارەکانیان ڕێکبخەن و پاك ڕایبگرن ئەوا ڕێژەی داهێنان و بەرهەمهێنانیان دوو هێندەو سێ هێندەتر بووە لە ماوەی یەك ڕۆژدا.

ئەو کەسانەی کە لەسەر مێزێکی ناڕێك و پڕ شت کاردەکەن ئەوا کاتێکی زۆر بەفیڕۆ دەدەن لە گەڕان بە دوای ئەو مادانەی کە پێویستیانە لەناو ئەو شتانەی کە لەدەوروبەریاندایە و بڵاوبۆتەوە.

لەڕووی دەروونییەوە، بینینی مێزێکی ناڕێك و نوسینگەیەکی ئاڵۆز وا دەکات کە لە هزری بە ئاگایتدا وەك

کەسێکی ناڕێک و پێک خۆت ببینیت. کە ئەمەش ڕێگاخۆشکەر دەبێت بۆ پچڕان وسەرقاڵ بوونت بە هۆی ئەوەی کە چاوت لەسەر بڕگەیەکەوە دەچێتە سەر بابەت و بڕگەیەکی دیکەو دەگەڕێتەوە سەر هەمان شت.

## کۆتایی

کۆتا خاڵ سەبارەت بە ڕێکخستنی کات بریتییە لە چەمکی هاوسەنگی. گرنگترین شت کە بتوانیت داهێنانی پێبکەیت لە ژیانی خۆتدا بریتییە لە هاوسەنگی و میانڕەوی. بە پەیڕەوکردن و مەشقکردنی ئەو ڕێگاو شێواز و بیرۆکانەی کە لەم پەرتووکەدا خراونەتەڕوو دەبیتە پێشەنگ و ڕێبەری ڕێکخستنی کات و کاتی زیاترت دەبێت بۆ ژیانی تایبەتی خۆت و خێزانەکەت.

هەمیشە خەڵکی بەرنامەی کات ڕێکخستن دەبینن تاوەکو بتوانن ژمارەی ئەو کارانە زیاتر بکەن کە دەتوانن ڕۆژانە ئەنجامی بدەن. پیاوە ژیرو داناکە دەڵێت: "زۆر شت هەن بۆ ژیان تاوەکو بە ئاسانی خێراییەکەی پێ زیاد بکەیت".

ئامانجی سەرەکی لە فێربوون و مەشقکردنی کارامەییەکانی ڕێکخستنی کات بۆ بەرەوپێش بردن و باشترکردنی ڕێگە شێوازی ژیانتە. بۆ زیادکردنی بڕی ئەو خۆشی و دڵخۆشییە کە ئەزموونی دەکەیت.

## شێوازەکانی ژیانت

کێشە نییە کە کارەکەت چەندە بۆت گونجاوە، شێوازی ژیانت بە شێوەیەکی سەرەکی بە سێ پێوەر پێوانە دەکرێت:

یەکەم/ شێوازی جیهانی ناوەوەتە. چەندە باشیت لەگەڵ خۆت چەندە خۆتت خۆشدەوێت و خۆتت بەدڵە وە چۆن بیر لە کەسایەتی خۆت دەکەیتەوە. پەرەدان بە جیهانی ناوەوەت پێویستی بە کات و بیرکردنەوە هەیە، لەگەڵ بیرکردنەوە سەبارەت بە پرسیارە مەزنەکانی ژیان.

دووەم/ بریتییە لە تەندروستی. هیچ سەرکەوتنێك هێندەی لەشساغی گرنگ نییە، کاتی خۆت تەرخان بکە بۆ خواردنی دروست و مەشقکردنی بەردەوام و پشوودان و حەسانەوەت. وە باشترین سوودمەندبوونت لەکات، ئەوەیە کە خەوێکی باشت هەبێت زوو بخەویت و زوو لەخەو هەستیت.

سێیەم و کۆتا شت وە گرنگترینیان ئەوەیە کە کات بۆ پەیوەندییەکانت دابنێیت. ئەو کەسانەی کە گرنگیت پێدەدەن و ئەو کەسانەش کە گرنگییان پێدەدەیت گەورەترین و گرنگترین هۆکاری ژیانتن.

هەرگیز ئەوەنده سەرقاڵی کارەکەت مەبە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان ببیتە هۆی پشتگوێخستنی پەیوەندییەکانت لەگەڵ هاوسەرو منداڵ و هاوڕێ نزیکەکانت.

باشترین ژیان، ئەو ژیانەیە کە هاوسەنگی تێدایە. ئەگەر کاتێکی باش و دیاریکراو تەرخان بکەیت بۆ نرخاندنی شێوازی پەیوەندییەکانت، ئەوا زۆر زیاتر دڵخۆش و ئاسوودە دەبیت لە کارەکەشتدا و سەرکەوتنت دەدۆزیتەوە.

دکتۆرێکی پیر دەڵێت: "هەرگیز قسەم لەگەڵ ئەو بازرگانەدا نەکردووە کە لەسەر جێگای مردنەکەی دەڵێت بریا کاتی زۆرترم لە نوسینگەکەم بەسەر ببردایە".

لە کۆتاییدا زۆر سوپاس بۆ ئێوەو بە هیوای بەختێکی باش لە بەکارهێنانی هەر یەکێك لەم بیرۆکانە لە هەموو بەشێکی ژیانتاندا.

*　　　*　　　*

238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsIbo_

Ktebi_PDF

